# كتاب

# مساوئ الأخلاق ومذمومها وطرائق مكروهها

للإمام الحافظ

أبي بكر محمد بن جعفر السامري الخرائطي

(٢٤٠-٣٢٧هـ) رحمه الله

وەرگێرانی :

فطوبى للغرباء

# كتاب
# مساوئ الأخلاق ومذمومها
# وطرائق مكروهها

للإمام الحافظ

أبي بكر محمد بن جعفر السامري الخرائطي

(٢٤٠-٣٢٧هـ) رحمه الله

وەرگێڕانی :

فَطُوبىٰ لِلغُرَباءْ

# چەند تێبینیەك بەر لە چوونە سەر كتێبەكە

١ - نەچوینە سەر ژیانی ئیمام، لە كتێبەكەدا هەیە سەیری بكەن، ویستم یەكسەر بچینە سەر وانەكان.

٢ - كە دەنووسرێ پیاوێك یان باسی پیاو دەكرێت بۆ ئافرەتیش بەهەمان شتە زۆربەی بابەتەكان، بەڵام چونكە پیاو ئەصڵە و تێكەڵ بوونی هەیە بۆیە دەگوترێ پیاو مەگەر شتێك بێت تایبەت كرابێت بەپیاوەوە، ئەوەش مانای ئەوە نیە كە ئافرەتان بڵێن لەگەڵ ئێمە نیە شتەكان .

٣ - حەدیثی دووبارەی لەدوای یەكتر باس ناكەینەوە، بەڵام گەر نێوانیان هەبێت ئەوا دایدەنێینەوە إن شاء الله.

٤ - سەبارەت بە سەنەدی حەدیثەكان ئەوەی منكر بێت نایهێنین بەڵام ضعیفەكان دەهێنین چونكە وریابە كە ضعیف بوو مانای ئەوە نیە وەرناگیرێ بەڵكو ئەو سەنەدەی لەم كتێبەدا هاتووە لاوازە گەرنا زۆربەی پاڵپشتی هەیە و دەگەنە ئاستی حسن و صحیح، بەڵام سەلەف دائمە كام سەنەدیان لابوایە ئەویان دادەنا رحمهم الله ،نەوەك وەك ئێمە هەموو شتێك بكەین بە هی خۆمان . وە لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی حدیثەكان كاریان پێدەكرێت گەرچی ضعیف بن چونكە أحكام نیە فضائل والترغیب و الترهیبە، بۆیە زاناكان لەم بوارە كار ئاسانیان كردووە.

٥ - کە بابەتێک نوسرابوو کەڕاھەت ئەوە مانای حەڕام دەگەیەنێت لە لای سەلەف وریابن نەوەك وا تێبگەن کە کردن یان نەکردنی ئاساییە، بۆیەش ئاگادارم کردنەوە ھەموو دەروازەکان نوسراوە کەڕاھەت. منیش بۆ ئەوەی وەک خۆی بهێنم وام نوسیوە گەرنا دەکرا بنووسین حەڕام لە جیاتی کەڕاھەت بەڵام لەوەوە تێبگەن..

٦ - ھەر لەسەر فەرموودەکان بۆیە حوکمم نەنوسیوە ئاخر ناکرێت من **٩٤٠** فەرموودە و ئەثەر حوکمی بنوسم گەر حوکمەکەی بنوسم دەبێ العلل واتا ھۆکاری زەعیفیەکەشی بنوسم بەم شێوە زۆر زۆری پێدەچێت و زۆر درێژ دەبێت ، وەک گوتم حدیثەکان لە سەدا ٩٥ ی کاریان پێ ئەکرێت، تەنھا منکرەکان نەبێت کە ئاماژەیان پێ دراوە .

٧ - عەرەبیەکەمان نەھێناوە حەتمەن گەر دامانناباوایە زۆری دەخایاند، وە پێویستە کتێبەکە دەست بخەن و لەوێدا سەیری حوکمی فەرموودەکان بکەن جا چ بە pdf بێت چ بیکڕن، نرخێکی کەمی تێدەچێ.

# باب : (١)

# ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەوشتی ناشرین و کەڕاهەتێتی ڕەوشتی ناشرین



١ - لە عائیشەوە رضی اللە عنها دەفەرمووێ : رسول اللە ﷺ فەرموویەتی : (ئەگەر هاتبووایە ڕەوشتی ناشرین پیاوێک بووایە و لە نێوان خەڵک ڕۆیشتبووایە ،ئەوا پیاوێکی زۆر خراپ دەبوو، وە اللە منی وا خەلق نەکردووە کە زمان پیس بم) .

٢ - لە دایکە عائیشەوە رضي اللە عنها دەفەرمووێ : رسول اللە ﷺ فەرموویەتی : (شوومێتی لە ڕەوشتی ناشرینە) .

٤ - فضیلی کوڕی عیاض دەفەرمووێ : (تێکەڵاویەتی کەسی ڕەوشت ناشرین مەکە، چوونکە بۆ غەیری شەڕ نەبێت بۆ هیچ شتێک بانگت ناکا).

———

: و اتا خێری پێوەنیە کەسی ڕەوشت ناشرین .

**٥** - رسول الله ﷺ دەفەرموویت : (لە شەقاوەتی بەنی ئادەم بریتیە لە ڕەوشتی ناشرین) .

**٦** - ئەبوو موسا ی ئەشعەری دەفەرمووێ : (سێ کەس دوعا دەکەن بەڵام دوعاکانیان وەڵام نادرێتەوە، پیاوێک کە ئافرەتێکی ڕەوشت ناشیرینی هەیە بەڵام تەڵاقی نادات، وە پیاوێکە کە ماڵەکەی دەدات بە کەسێکی گێل و نەزان لە کاتێکدا الله دەفەرمووێ : ماڵی خۆتان تەسلیمی گێل و نەفام مەکەن، وە پیاوێکە شت دەفرۆشێت و شاهێد ناگرێت) .

---

: ئەم ئەثەرە بۆ ئاگادارکردنەوەیە و چونکە کە یەکێک ئافرەتێکی ناشیرینی لە لابوو دوعا دەکات الله ئیصلاحی بکات بەڵام خۆی پێی ڕازی بووە، ئەوانی تریش هەروا ماڵی دەداتە نەزان وماڵەکەی دەفەوتێ و دووعا دەکا.

**٨** - رسول الله ﷺ دەفەرموویت : (لە شەقاوەتی بەنی ئادەم بریتیە لە ڕەوشتی ناشیرین) .

**٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (دوو ڕەوشت هەیە لە مرۆڤی ئیماندار کۆنابێتەوە ڕەوشت ناشرینی و بەخیلی) .

١٠ - ئەبوو حازم دەفەرمووێ : (کەسی ڕەوشت ناشیرین شەقاوەترین کەسە بۆئەوەی لەگەڵیەتی بۆتە بەڵا بەسەریەوە، بۆ خێزانەکەشی، دواتر منداڵەکەی، هەتا کە دەچێتەماڵەوە ئەوان لەسەر جێگان و گوێیان لە دەنگی دەبێت لەبەری ڕادەکەن، وە هەتا ئەو گیاندارەی دەیبینێ خۆی بەردی لێدەدا، وە سەگەکەشی دەیبینێ دەچێتە سەر دیوار، وە هەتا پشیلەکەیشی لەبەری ڕادەکات).

١١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی ڕەوشتی جوانە کەسێکە لە بەرزی دایە، وە ڕەوشت ناشرینی شومێتیە) .

١٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی بەندە هەیە بەهۆی ڕەوشت ناشیرینیەکەی دەگاتە طبقەی خوارووی جەهەننەم لەکاتێکدا کە عیبادەتکاریشە) .



## باب : (٢)

# كەڕاهەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی لەعنەت کردن لە ئیماندار و تەکفیر کردنی



**١٣** - لە ئەبوو ذره وە رضی اللّٰه عنه دەفەرمووێ : رسول اللّٰه ﷺ فەرموویەتی : (هیچ پیاوێک نیە کە پیاوێک تۆمەتبار بکات بە فیسق یان تاوانباری بکا بە کوفر، ئیلا دەگەڕێتەوە بۆخۆی ئەگەر ئەم کەسە وانەبێت کە تۆمەتباری کردوە) .

**١٤** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک بانگی یەکێک بکات بە کافر یان بڵێ ئەی دوژمنی اللّٰه، بەڵام ئەو وانەبێت ئیلا بۆخۆی دەگەڕێتەوە).

**١٥** - عبداللّٰه ی کوڕی مسعود دەفەرمووێ : (هیچ دوو موسڵمانێک نین ئیلا لە نێوان خۆیان و نێوان اللّٰه ﷻ پەردە هەیە، ئەگەر یەکێکیان وشەیەکی ناشرینی بەوی تر گووت ئەوا پەردەی نێوان خۆیان و نێوان اللّٰه ﷻ

یان شكاندووه، وه هەر كەسێك به یەكێكی تر بڵێت تۆ كافری، ئیلا یەكێكیان كافر دەبن).

١٧ - عبدالله ی كوڕی مسعود دەفەرمووێ : (ئەگەر كەسێك به برایەكی موسڵمانی بڵێت : تۆ دووژمنی منیت، ئیلا یەكێكیان كافر دەبن به ئیسلام).

١٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هیچ كەسێك نیه شاهێدی بدات لەسەر كەسێك به كوفر ئیلا بۆ یەكێكیان دەگەڕێتەوه، ئەگەر بێت و كافر بێت ئەوا وەك ئەوەیە كه گووتویەتی، وه ئەگەر بێتوو كافر نەبێت ئەوا كافر بووه بەو تەكفیره -باطڵەی - كردوویەتی) .

١٩ - ئەبوو هورەیرە رضی الله عنه دەفەرمووێ : (خۆتان به دوور بگرن لەوەی دوو هاوڕێی لەعنەت كار بن).

٢٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر پیاوێك به برا موسڵمانەكەی بڵێت تۆ دووژمنی منیت، ئەوا تاوانەكە بۆ یەكێكیان دەگەڕێتەوه ئەگەر ڕاست بكات و وابێت، ئەگەر وانەبێت ئەوا دەگەڕێتەوه بۆ كەسی یەكەم) .

٢١ - ثابتی كوڕی الضحاك دەفەرمووێ : (هەر كەسێك ئیماندارێك تۆمەتبار بكا به كوفر وەك كوشتنی وایە) .

٢٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لەعنەت کردن لە ئیماندار وەك کوشتنی وایە) .

: سەبارەت بە تەکفیر کردنی یەکێك بە جەهلەوە ئەوا کوفرێکە دەرکەرنیە لە دین بەڵکو کوفری بچوکە پێتەوە، بڕوانە کتێبی إبانە الکبری ی إبن بطة .

وە کافرکردنی یەکێك کە کافرە ئەوە حەقە وەك لە ئەثەری ژمارە ١٨ هاتووە گەر یەکێك تەکفیر کرا بە حەق ئەوا ناکرێ بێ ئەو ئەثەرانە بە نێو چاوی کابرا دابدەی چونکە گوتنی وشەی کافر بە یەکێك کە کافرە جوێن نیە و ڕەوشتی ناشیرین نیە، بەڵکو حەقە و ئەجرە و فەرزە بەری ببەین لە کافر، بەڵام وریابن لە تەکفیری بە هەوەس کە ئەمڕۆ بەربڵاوە . . . والله أعلم بالصواب .



## باب : (٣)

# كەڕاهەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی جنێودان بە خەڵکی و دەم خستنە ناموسیان

**: باسمان کردن لە پێشتر کە کەڕاهەت لای سەلەف و اتای حەڕامە نەوەك ئازاد بێ .**



**٢٤** - جابری کوڕی سولەیم رضی الله عنه دەفەرمووێ : گووتم ئەی رسول الله ﷺ شتێکم پێ بڵێ وەك عەهدێك بێت بۆم، رسول الله ﷺ فەرمووی : (جنێو بە هیچ تاکێك مەدە - هیچ شتێك - )، دوای ئەوە هیچ جنێوێکم نەدا نە بە ئازاد، نە بە کۆیلە، نە بە مەڕ، نە بە وشتر.

**٢٥** - جابری کوڕی سولەیم دەفەرمووێ : چوومە لای رسول الله ﷺ وە ئەویش خۆی داپۆشی بوو بە پارچە پەڕۆیەك تا قاچی ، گووتم کامتان محمد ن پەیامبەری الله؟ ئەویش بە دەستی نیشانەی بۆ خۆی کرد، گووتم ئەی رسول الله ﷺ من خەڵکی دەشتم وە لە گووندەکەمان قسەم وەردەگرن

ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی : (ئەگەر یەکێك عەیبداری کردی بەشتێك کە لە تۆ دەیزانێت، تۆ قسەی پێ مەڵێ بەوەی لەودا دەیزانیت، بەم شێوە پاداشتەکەی بۆتۆیە و تاوانەکەش لەسەر ئەوە) .

٢٦ - جابری کوڕی سولەیم دەفەرمووێ : چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ خۆی داپۆشی بوو بە پارچە جلێك تا خوار قاچی داپۆشیبوو گووتم ئەی رسول الله ﷺ ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی : (ئاگادارت دەکەمەوە بە تەقوای الله، وە کە یەکێك عەیبداری کردیت بە شتێك کە لێت دەزانێت، تۆ عەیبداری مەکە بەوەی کە لە ئەو دەزانیت با تاوانەکە لەسەر ئەو بێت، وە پاداشتەکەیشی بۆتۆ بێت، وە جنێو بە هیچ شتێك مەدە)، دوای ئەوە جنێوم بە هیچ شتێك نەدا .

٢٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ناڕەحەتی هەڵگیراوە لەسەر هەموو کەسێك، ئیلا مەگەر یەکێك دەمی خستۆتە ناموسی برایەکەوە بە زووڵم و بە قەرز، ئەم کەسە الله ناڕەحەتی دەخاتە ڕێگای و بە هیلاکی دەبات) .

---

: بۆیە دەفەرمووێت : بە قەرز چوونکە قەرزێکە دەبێت بدرێتەوە وەك لە ئەثەری ژمارە چل باسکراوە .

٢٨ - كۆمەڵێك دەشتەكی هاتنە لای رسول اللّٰه ﷺ پرسیاریان دەكرد ئایا لەمە تاوانبارین ،ئایا لەمە تاوانبارین رسول اللّٰه ﷺ فەرمووی : (ئەی بەندەكانی اللّٰه بەڕاستی اللّٰه ﷻ نارەحەتی هەڵگرتووە لەسەرتان، مەگەر یەكێك بە قەرز دەم بخاتە نامووسی خەلكی، ئەوا دەبێتە هۆی بارگرانی بۆی) .

٣٠ - معاذی كوڕی جبل دەفەرمووێ : رسول اللّٰه ﷺ پێی فەرمووم : (قەدەغەت لێدەكەم لەوەی جنێو بە موسڵمانێك بدەی، وە سەرپێچی ئیمامێكی دادوەر بكەی) .

٣١ - رەبیعی كوڕی خوثەیم گەورە تابعی دەفەرمووێ : (من لە نەفسی خۆم ڕازی نیم چۆن چۆنی زەمی خەڵك بكەم؟).

٣٢ - عیاض ی كوڕی عمار رضی اللّٰه عنه دەفەرمووێ : گوتم ئەی رسول اللّٰه ﷺ پیاوێك لە قەومەكەم جوێنم پێ دەدات وە لە خوار دەسەلاتی منە من لەو بەهێزترم، ئایا هیچ تاوانم لەسەرە تۆڵەی لێ بكەمەوە، رسول اللّٰه ﷺ فەرمووی : (ئەو دوو كەسەی جنێو بە یەكتری دەدەن هەرچیەك بڵێن، ئەوان دوو شەیطانن درۆ دەكەن وە قسەكانیان بێ بنەمان) .

———

: بۆیە دەڵێ درۆ دەکەن چوونکە بەرلەوەی جنێو بدەن ئەو شتانەیان بە یەکتر نەگووتوە .

٣٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو دوو کەسەی کاتێك جنێو بە یەکتر دەدەن تاوانی هەردووکیان لەسەر ئەمەیە کە سەرەتا جنێوی دا، هەتاکو ئەوەی جنێوی پێدراوە سنوور دەبەزێنێ) .

٣٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (جنێودان بە موسڵمان فیسقە، وە کوشتار کردنی کوفرە) .

---

: ئەم فەرموودەیە نابێ وەك خەواریج تێبگەین بەڵکو کوفری بچووکە و تاوانی گەورەیە، بەڵام گەرخوێنی موسڵمان بە حەڵاڵ بزانێت کوفرە .

٤٠ - ئەبوو هورەیرە دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئایا دەزانن موفلیس کێیە؟)

گوتمان : نەخێر .

فەرمووی : (موفلیس لە ئوممەتی من ئەو کەسەیە کە ڕۆژی قیامەت دەیهێنن، لە فلانە کەسی داوە، وە جوێنی بە فلان داوە، وە ماڵی فلانە کەسی بردووە، لە چاکەکانی هەڵدەگرن دەیبەن بۆ سەر میزانی خەڵکانی تر، وە

ئەگەر هەر زیاد بوو لەسەری، ئەوا تاوانی ئەوانی بۆ دێنن و بە حسابی ئەوی دادەدەن و، دواتر فڕێی دەدەنە ناو ئاگر) .

٤١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر كەس زیان بە موسڵمانێك بگەیەنێت الله زیانی پێدەگەیەنێت بەهۆی ئەوەوە، وە هەر كەس موسڵمانێك نارەحەت بكا ئەوا الله نارەحەتی دەهێنێتە ڕێگای بەهۆی ئەوەوە) .

٤٢ - ئەنەسی كوڕی مالك رضی الله عنه دەفەرمووێ : بەڕاستی رسول الله ﷺ نە جنێو دەر بوو نە دەم پیس بوو، كاتێك سزای یەكێكمانی دەدا دەیفەرموو : (دەم وچاوت خۆڵاوی بێت) .

عبدالله ی كوڕی مبارك دەفەرمووێ : واتا لە نوێژدا

٤٣ - زەیدی كوڕی ئەسلەم دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ : پیاوێك دوای عبدالله ی كوڕی عمر كەوتبوو و هەر جنێوی پێی دەدا، إبن عمر بێدەنگ بوو، كابرا هەر دوای كەوت تا إبن عمر گەشتەوە بەر دەرگا، إنجا عبدالله ی كوڕی عمر ئاوڕی لێی دایەوە و پێی فەرموو : (بەڕاستی من و عاصمی برام جنێو بە خەڵك نادەین) .

٤٤ - شەعبی چووە ماڵی كوڕە مامێكی لەو كاتەدا ئەو كوڕە بە تەنیا لە ماڵ بوو، نێوانیان بە یەكەوە پچڕابوو، كوڕە مامەكەشی یەخەی ئیمامی

شەعبی گرت، و جنێوی ناموسی پێی دا، شەعبی >ش هاتە دەرەوە و فەرمووی : (نۆشی گیانم بێت ئەو هەموو چاکەیەی بۆم هات بەبێ ئەوەی ماندوو بم بە بۆنەی ئەو کەسەی کە بۆی حەڵاڵ نیە) .

پیاوەکەش گوتی : ئەی باوکی عمرو، لێم ببورە، واللّٰهی کاری وا ناکەمەوە) .

٤٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (شەیطان کلی چاو و لیکی هەیە، ئەگەر مرۆڤ کلەکەی شەیطانی پێ گەیشت ئەوا چاوی هەڵدەگەڕێتەوە، وە کاتێك لیکەکەی گەشت پێی ئەوا زمانی بەس لە شەڕ دەگەڕێت) .

٤٦ - لە ئەبوو هورەیرەوە دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئەی خەڵکینە ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟)

گووتیان : ڕۆژی حەڕامە .

فەرمووی : (ئەی چ مانگێکە؟)

فەرموویان : مانگی حەڕامە .

فەرمووی : (ئێرە چ شارێکە؟)

فەرموویان : شاری حەڕامە .

فەرمووی : (دەی الله ﷻ حەڕامی کردووە خوێنتان، ماڵتان، وە ناموستان، هەر وەکو حەڕامێتی ئەم ڕۆژەتان و ئەم مانگەتان) .

٤٧ - فەرموودەی پێشووتر لەگەڵ زیادەی (سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی اللهم شاهێد بە من گەیاندم) .

٤٨ - عبیدالله ی کوڕی عمر جنێوی بە مقدادی کوڕی عەمر دا رضی الله عنه، ئیمامی عمر کە پێی گەیشتەوە فەرمووی : (نەزرێکم لەسەر بێت گەر زمانی نەبڕم) .

هاوەڵانی رسول الله ﷺ چوون بۆ لای و قسەیان لەگەڵ کرد - واتە ئارامیان دەکردەوە - ، فەرمووی : (لێم گەڕێن با زمانی ببڕم بۆ ئەوەی لە دوای من جنێو بە هاوەڵانی رسول الله ﷺ نەدرێت) .

٤٩ - زەیدی کوڕی ئەسلەم دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ : (ئیمامی عمر ناردی بە دوای حطیئة ی شاعیر، وە منیش لە لای بووم، وە عەمری کوڕی عاص و بڕێك لە هاوەڵان لەوێ ئامادە بوون، ئیمامی عمر یش دەریهێنا لە زیندان و، حطەیئة ی شاعیر گووتی :

چی دەڵێی دەربارەی کەسێك کە هیچ قازانجێکی نیە، وەك قەلە ڕەشێکی سینگ و توك سپی نە ئاوی لایە و نە خواردن، دەچێت بۆ دابین کردنی بژێوی بۆ خێزانەکەی، لێی خۆش بە ئەی پاشای خەڵك لێت خوش

بێ، تۆ ئەو ئیمامەی کە لە دوای هاوەڵەکەت - ئەبووبەکری صدیق - هاتووی، وە کاروباری خەڵکی دا دەست تۆ، تۆیان کردۆتە خەلیفە نەوەك لەبەر خۆت، بەلکو بۆ ئەوان کەسێکی باش بوویت، ئازادم بکە و لێم خۆش بە و لێرە ڕزگارم بکە، چوونکە ماڵ و مناڵ چاوەڕێی هەواڵی منن، (دواتر ئیمامی عومەر دەستی کرد بە گریان، دواتر ئیمامی عەمری کوڕی عاص فەرمووی : مادام ئیمامی عومەری گریاند ئەوا گوومان نیە کە لێی خۆش دەبێت) .

ئیمامی عومەر فەرمووی : (کورسیەکم بۆ بێنن) .

کورسیان هێنا و لەسەری دانیشت، بە هاوەڵانی فەرموو : ڕاوێژتان پێدەکەم لەسەر ئەم شاعیرە، بەڕاستی ئەمە بە زمانی قسەی زۆر ناڕەوا دەکات، وە مەدحی کەسان دەکات کە تێیان دا نیە، من وایدەبینم کە دەبێت زمانی ببڕدرێ .

دواتر فەرمووی : تەشتێکم بۆ بهێنن وە مقەسێك م بۆ بهێنن و چەقۆیەکم بۆ بێنن، نا موسێك بهێنن .

هاوەڵان فەرموویان : وای لێمەکە ئەی ئیمام ئیتر وازدەهێنێت و ناگەڕێتەوە سەر شیعر و جنێو دان، وە ئیشارەتیان بۆ کرد کە بڵێ تەوبە دەکەم و وازدێنم .

ئیمامی عومەر فەرمووی : (ئەوە ئازادم کرد) .

كە شاعیرەكە ویستی بڕوات ئیمامی عومەر فەرمووی : (من وای دەبینم ڕۆژێك دێت تۆ لەگەڵ گەنجانی قوڕەیش كۆدەبیتەوە و پۆشاكی جوان دەپۆشیت و داتدەنێن لەسەر كورسی، تۆش گۆرانی و شیعر بەسەر نامووسی موسڵمانان دەڵێی) .

زەیدی كوڕی ئەسلەم دەفەرمووێت : دوای وەفاتی ئیمامی عومەر من چووم بۆ لای عبیداللە ی كوڕی ئیمامی عومەر و بینیم حطەیئة لەوێیە و پۆشاكی لەبەر كراوە و لەسەر كورسی دایانناوە و ئەمیش گۆرانیان بۆ دەڵێت، منیش گووتم ئەی حوطەیئە ئایا بیرتە ئیمامی عومەر چی پێ گوتیت؟

ئەویش برێك هەڵوێستی كرد و گووتی : ڕەحمەتی اللە لە عومەر بێت ، واللە گەر ئەو مابووایە نەماندەتوانی وا بكەین .

ئینجا عبیداللە ی كوڕی عومەر گووتی باوكم چی گووتوە؟؟ منیش گوتم وایگووت .... ، تۆش ئەو گەنجە قوڕەیشیە بوویت كە خزمەتی ئەم شاعیرەت كرد .

---

**: حوطەیئە شاعیرێك بووە وەك ئەم چاوەش و بەناو هوونەرمەندانەی ئەمڕۆ كە باسی نامووسی خوشك ودایك و سینگ و. ..شتی ئێمەی موسڵمان دەكەن ئێوەش بۆیان هەڵدەپەڕن و پارەیان پێ دەدەن و پێیان دەڵێن ئیمپڕاتۆر ،كە ئەوە حوكمیانە لای ئیمامی عومەری كوڕی خطاب دەبوو ایە زمانی ببڕدرێ بۆئەوەی نامووس و شەڕەفی موسڵمان**

**بپارێزرێ بۆیەش دەبینین بە هەموو شێوەیەك خوشکانمان هەڵخەتاون بە گۆر انی و ئاواز و شتی تر..**

٥٠ - عبدالرحمن ی کوڕی حسان کە شاعیرێك بوو، شیعر لەسەر کچەکانی ئیمامی معاویە ی کوڕی سوفیان دەڵێت و یەزیدی کوڕی معاویە ش دەچێتە لای باوکی و دەڵێت : ئایا نەتزانیوە کە فلان چی بە کچەکەت دەڵێت .

ئیمامی معاویە گووتی : چی دەڵێت؟

گووتی دەڵێ : بەڕاستی ئافرەتێکە وەك گوڵ جوانە و وەك بڵێی ڕواوە و گەوهەرێکە .

ئیمامی معاویە گووتی : (دەی ڕاست دەکات) .

گووتی : وە دەڵێ بەڕاستی ناتوانی ئافرەتی وا باشت دەست بکەوێت وە نموونەی ڕەوشت جوانین .

ئیمامی معاویە فەرمووی : ڕاست دەکا .

گووتی وە دەڵێ : دەستم گرت و چووین بۆ پیاسە قسەمان بۆ یەکتر دەکرد، ئیمامی معاویە گووتی : درۆ دەکات .

: ئەمە ئەوەشمان پێ دەڵێت کە دەبێ خۆمان نەهێنینە ئاستی یەکێك کە جنێومان پێ دەدات وە ئارام بگرین لەسەرئەو نەزان و نەفامانەی باسمان دەکەن بەتایبەت لەم سەردەمە پڕ فیتنەیەدا .

**٥١** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (وە گەر یەکێك عەیبداری کردیت بە شتێك کە لە تۆدا هەیە، تۆ عەیبداری مەکە بە شتێک کە لەودا هەیە، پاداشتەکەی بۆ تۆیە و تاوانەکەش لەسەر ئەوە) .



# باب : (٤)

# کەڕاهەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی قسەی بەتاڵ و زمان پیسی



**٥٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی الله ڕقی لە زمان پیسی و قسەی پڕوپوچە).

**٥٣** - ئەنەسی کوڕی مالك رضی الله عنه دەفەرمووێ : (بەڕاستی رسول الله ﷺ نە جنێو دەر بوو نە دەم پیس بوو، کاتێك سزای یەکێکمانی دەدا دەیفەرموو (دەم وچاوت خۆڵاوی بێت) .

عبداللەی کوڕی مبارك دەفەرمووێ : واتا لە سوجدەدا .

**٥٤** - عطاء ی کوڕی أبي رباح دەربارەی ئایەتی | وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥ | **[الأَنبِيَاءِ : ٩٠]**

دەفەرمووێ : (لە ڕەوشتی دا خراپە هەبوو، وە زمان درێژبوو، وە قسەی بەتاڵی دەکرد، الله ﷻ بۆی ئیصلاح کرد) .

---

: بۆیه الله ﷻ خێزانی زەکەریا علیه السلام ی إصلاح کرد چونکه موسڵمان بوو، وەك خێزانی لوط علیه السلام کافرنەبوو .

**٥٥** - أم سلمة رضی الله عنها دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ هیچ کاتێك تانەی نەداوە لە کەسایەتی هیچ کەس، و لە ڕەچەڵەکی هیچ کەسیش).

---

: لە خەڵك لای خۆمان دەڵێن و اتا پەللاری لە خەڵك نەداوە، سەبارەت بەم باسە فەرموودەیەکی تر هەیە کە رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (**دووشت هەیە کوفرن بە خەڵکەوەن، شین وشەپۆڕ لەسەر مردوو، وە طعن دان لە ڕەچەڵەکی خەڵك**) - کوفری بچووك .

**٥٦** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (**ئەوەندە بەسە بۆ پیاوێك کە بە کەسێکی ناشرین لە قەڵەم بدرێت لە کاتێکدا کە جنێو دەر و بەخیل بێت**) .

**٥٧** - شریح ی قاضی دەفەرمووێ : (مرۆڤی بێ ئەرزش - **زمان پیس** - ئەو کەسەیە کە خەڵك کاتێك دەیبینێت دەڵێت وریابن و خۆتانی لێ بپارێزن ئەمە کەسێکی سوك و بێ ئەرزشە).

٥٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لە نیشانەکانی قیامەت بریتیە لە جنێودان و خۆفێرکردن ی جنێو و دراوسێی خراپ).

---

: خۆ فێرکردنی جنێو ئەمڕۆ دەبینین بە ئاشکرا هەیە بەڵام وریابن هەربە تەنیا دانیشتن لای جنێودەرئەوفەرمووده دەیگرێتەوە، الله أعلم .

٦١ - عبداللّەی کوڕی عەمری کوڕی عاص رضی الله عنهما دەفەرمووێ : (بەڕاستی رسول الله ﷺ نە جنێو دەر بووە نە خۆیشی لێ فێرکردووە و کەسی فێر نەکردووە).

٦٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی الله رقی لەو پیاوانەیە کە زۆر لەخۆیان دەکەن لە کاتی قسە کردن، کە زمانی دێنێ و دەبا وەك مانگا کە چۆن کاوێژ دەکات).

٦٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمویٚ : (بێزراوترین کەستان لەلای من، وە ئەوەی مەجلیسی زۆر لەمن دوورە ، بریتین لە وانەی قسەی بەتاڵ زۆر دەکەن، وە زمانیان پیسە بەرامبەر خەڵکی، وە خۆ بە گەورە زانەکان).

٦٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی بێزراوترین و بوغزاوترین کەس لەلای الله بریتیە لە الألد الخصيم) .

---

: الألد الخصيم : یەكێكە لە نیشانەكانی قیامەت ،بریتیە لەوەی كاتێك موناقەشەت لەگەڵ یەكێک هەیە ئەو دەڕوا بۆ باسێكی تر، بەنموونە ئێوە باسی بیدعە دەكەن ئەو دەڵێ ئەی فلانە شت ،ئەی فلانە كەس .

٦٦ - بشری التغلبي دەفەرمووێ باوكم پێی ڕاگەیاندم و گوتی : (دانیشتبووین لەلای ئەبوو دەرداء رضی الله عنه، لەو كاتەدا سهلی كوڕی حنظلیة بەلاماندا تێپەڕی رضی الله عنه بە ئەبوو دەرداء ی گووت حەدیثێكم پێ بڵێ لە رسول الله ﷺ وە زەرەرت پێ نەگەیەنێت، فەرمووی رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئێوە دەگەن بە براكانتان، بۆیە خۆتان و كاروبارتان ڕێك بخەن، تاكو وەك خاڵێك دەركەون لەناو خەڵكیدا، وە الله جنێودان و خۆفێڕكردنی جنێوی خۆش ناوێت).

٦٧ - شفي كوڕی ماتع الأصبحي دەفەرمووێ : (لە ڕۆژی قیامەت كاتێک خەڵكەكە دەخرێنە ئاگر ،یەكێك كێم و بۆن لە دەمی دێتە دەرەوە و ئەزیەتی ئەوانەی تر دەدات ، ئەوانیش دەڵێن ئەمە كێیە وا ئەزیەتمان دەدات لەسەر ئەو ئەزیەتەی لەسەرمانە، وەڵام دەدرێنەوە و دەڵێن ئەمە كەسێكە هەر قسەیەكی خراپی بەسەر دەم هاتبێ كردوویەتی، وە چێژی دەبینی لە جنێودان بە خەڵكی، نەشگەڕاوەتەوە لە باسی نامووسی خەڵك یان باسی عەورەت و دامێن).

٦٨ - رسول الله ﷺ له ڕۆژی بەدردا نەهی کرد کە قسە بە مردووی مووشریکان بدرێت و فەرمووی : (بە ڕاستی ئەوەی ئێوە پێیان دەڵێن پێیان ناگات، وە بەم شێوە زیندووەکان ئەزیەت دەدەن، ئاگاداربن زمان پیسی لۆمەکراوە).

٦٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (جنێو بە مردوان مەدەن، بەم شێوە زیندوەکان ئەزیەت دەدەن، وریابن قسەی بەتاڵ لۆمە کراوە).



## باب : (٥)

# کەڕاهەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی لەعنەت لە یەکتر کردن و لەعنەت کردن لە ئاژەڵان



٧٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لەعنەت لە یەکتر مەکەن نە بە لەعنەتی اللّٰه، نە بەتوڕەیی اللّٰه، وە نە بەجەهەننەم).

وە زۆرجار أيوب السختياني دەیفەرموو : دوعا لە یەکتر مەکەن بە لەعنەتی اللّٰه .

٧١ - حذیفەی کوڕی یەمان رضي اللّٰه عنه دەفەرمووێ : (هیچ کەسانێك نین کە لەعنەت لە یەکتر بکەن ئیلا جێبەجێ دەبێ لەسەریان).

٧٢ - عمرانی کوڕی حصین رضي اللّٰه عنه دەفەرمووێ : لە سەفەرێکدا بووین لەگەڵ رسول اللّٰه ﷺ، ئافرەتێکی ئەنصاڕی مان لەگەڵ بوو لەسەر وشترەکەی بوو، وشترەکەی بە هێواشی دەڕۆیشت و بێزاری کرد، ئافرەتەکەش لەعنەتی لێ کرد .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (چی لەسەرە دایبگرن وە بەڕەڵای بکەن چونکە ئەوە مەلعونە) .

عمران ی کوڕی حصین دەفەرمووێ : بینیم وشترەکە بەناو خەڵکدا دەڕۆیشت وە هیچ کەسیش بۆخۆی نەدەبرد و دەستکاری نەدەکرد .

**٧٣** - سالم ی کوڕی إبن عمر دەفەرمووێ : (عبدالله ی کوڕی عمر هیچ کات لەعنەتی نەکردووە لە هیچ کام لە خزمەتکارەکانی، جگە لە یەکجار ئەویش ڕاستەوخۆ ئازادی کرد) .

**٧٤** - ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ لەگەڵ هاوەڵاکانی دەڕۆیشت بە ڕێگادا، پیاوێك لەعنەتی کرد لە وشترەکەی، ئەویش فەرمووی ﷺ : (دابەزە لەسەری و بەڕەڵای بکە چونکە وەڵام درایەتەوە) .



## باب : (٦)

## چی هاتووه دەربارەی یەکێك جنێو بدات بە باوکی و لەعنەتی لێ بکات و قێزەونیەکەی لە لای الله ﷻ



٧٥ - ئەبوو طوفەیل دەفەرمووێ : (من لای ئیمامی علی رضي الله عنه بووم، پیاوێك هات بۆ لای و گوتی : هەواڵم پێ بدە بە شتێك کە رسول الله ﷺ بە تایبەت بە تۆی گوتبێ و لە لای کەسی باس نەکردبێ .

ئیمامی عەلی ش زۆر تورەبوو گووتی : بەڕاستی رسول الله ﷺ هیچ شتێکی بە نهێنی بە من نەگووتوە و لە خەڵکی شاردرابێتەوە، جگە لەوەی حدیثێکی پێگووتم باوەڕناکەم هەموو کەس بیزانێت کە چوار کەلیمەیە.

گوتی ئەوانە چین ئەی ئیمامی باوەڕداران؟

گوتی فەرمووی : (لەعنەتی الله لەو کەسە بێت کە لەعنەت دەکات لە دایك وباوکی، لەعنەتی الله لەو کەسە بێت شتێك سەردەبڕێت بۆ غەیری

اللّٰه، لەعنەتی اللّٰه لەو کەسە بێت کە پەنای بیدعەچیەك دەدات، لەعنەتی اللّٰه لەو کەسە بێت کە توخمی زەوی دەگۆڕێت) .

٧٦ - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی جنێو بە باوکی دەدات، نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی جنێو بە دایکی دەدات).

٧٩ - عبداللّٰه ی کوڕی عەمری کوڕی عاص رضي اللّٰه عنهما دەفەرموێ : گوێم لێبوو رسول اللّٰه ﷺ فەرمووی : (لە گەورەترینی تاوانە گەورەکان ئەوەیە کە یەکێك جنێو بە باوك و دایکی بدات) .

فەرموویان ئەی رسول اللّٰه ﷺ چۆن جنێو بە دایك و باوکی دەدات؟

فەرمووی : (جنێو بە باوکی یەکێك دەدات، ئەویش جنێو بە باوکی دەداتەوە، جنێو بە دایکی یەکێك دەدات، ئەویش جنێو بە دایکی دەداتەوە).

٨٠ - عبداللّٰه ی کوڕی عەمر رضي اللّٰه عنهما دەفەرمووێ : (لە گەورەترینی تاوانە گەورەکان ئەوەیە کە یەکێك جنێو بە باوك و دایکی بدات) .

گوتیان : چۆن جنێو بە دایك و باوکی دەدات؟

فەرمووی : (جنێو بە باوکی یەکێك دەدات، ئەویش جنێو بە باوکی دەداتەوە، جنێو بە دایکی یەکێك دەدات، ئەویش جنێو بە دایکی دەداتەوە).

٨١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی نەفرەت دەکات لە دایك و باوکی).

٨٢ - سعیدی کوڕی موسەیب دەفەرمووێ : (هەر کەسێك شەڕی لەگەڵ باوکی خۆی کرد و لێی دا ئێوەش لێس بدەن ، - تا کوشتن بیبەن - ).

٨٣ - لە سعیدی کوڕی المسیب ـەوە دەگێڕێتەوە، لە رسول الله ـەوە ﷺ کە فەرموویەتی : (هەر کەسێک لە باوکی دا ئەوا بیکوژن) .

---

: أحمد بن حنبل رحمه الله دەفەرمووێ : ئەگەرکەسێک باوکی بینی لەسەرکارێک کە بەلایەوە خراپ بوو قسەی لەگەڵ ئەکات بە بێ توندوتیژی و خراپە کردن لەگەڵی و قسەی ڕەقی لەگەڵ ناکات، ئەگەرنا با وازی لێ بێنێت باوک وەک کەسی بێگانە نیە.

📖 زاد المسافر ٥٦٦/٤



## باب : (٧)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی یەكێك خۆی بەری بكات لە باوكی، وە لە كوڕەكەی، وە لە ڕەچەڵەكی ،خۆی بداتە پاڵ غەیری عەشیرەتی خۆی



٨٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هیچ كەسێك نیە خۆی بداتە پاڵ جگە لە باوكی خۆی، لەكاتێكدا دەشزانێ ئەوە باوكی نیە، ئیلا كوفری كردووە، وە هەركەسێ شتێك هی خۆی نەبێت و بڵێ هی منە و بیكات بە هی خۆی لە ئێمە نیە).

٨٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئاگاداربن هەر كەسێك خۆی بداتە پاڵ جگە لە باوكی خۆی، یان جگە لە بەردەستەكەی خۆی، پشتیان تێبكات، لەعنەتی الله و فریشتەكان و هەموو مرۆڤێكی لەسەرە).

٨٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێك خۆی بداتە پاڵ جگە لە باوکی، یان پشت بکاتە گەورەکەی خۆی، ئەوا بۆنی بەهەشت ناکات، لە کاتێکدا بۆنەکەی حەفتا ساڵ دەڕوات، یان پێنج سەد ساڵ).

٨٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەڵمەگەڕێنەوە لە باوانتان، هەر کەس هەڵبگەڕێتەوە لە باوکی خۆی ئەوا کوفری کردووە) .

٨٨ - ئیمامی ئەبووبەکر دەفەرمووێ : (کافر بوونە بە الله خۆبەری کردن لە ڕەچەڵەك وە ئاگاداریش بێ، وە کافر بوونە بە الله خۆ دانە پاڵ ڕەچەڵەکێك کە نایناسی).

٨٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لە گەورەترینی درۆیە گەورەکان ئەوەیە یەکێك خۆی هەڵبداتەوە بە غەیری باوکی) .

٩٠ - مصعب ی کوڕی سعد دەفەرمووێ : (هەرکەس خۆی بداتە پاڵ باوکی، وە بشزانێ باوکی کێیە، بەهەشتی لەسەر حەڕامە).

٩١ - معاذی کوڕی جبل دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرمووی : (لەناو بەندەکاندا هەندێك بەندە هەن کە الله قسەیان لەگەڵ ناکات) .

گووتیان : کێن ئەوانە ئەی رسول الله ﷺ .

ئەویش فەرمووی : (ئەوەی خۆی بەری دەكات لە دایك و باوكی، وە پیاوێكیش كە خەڵكانێك چاكەیان لەگەڵ كردووە ئەویش كوفرانەی چاكەكەیان دەكات، و خۆی بەری دەكات لێیان).

**٩٢** - أبو عثمانی نەهەدی دەفەرمووێ : گوێم لە سعدی كوڕی ئەبی وەقاص بوو فەرمووی : بە گوێیەكانی خۆم گوێم لێبووە وە دڵیشم وەریگرتووە لە محمد ﷺ كە فەرمووی : (هەر كەس خۆی بداتە پاڵ جگە لە باوكی بەهەشتی لەسەر حەرامە) .

ئینجا گەیشتم بە ئەبووبەكر ی صدیق ئەویش گووتی منیش بە گوێیەكانی خۆم بیستم .

**٩٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (گەورەترینی درۆكان سێ دانەن : كەسێك درۆبكات بە دەمی منەوە، وە كەسێك درۆبكات لەسەر چاوەكانی خۆی - واتا خەون -، كەسێكیش خۆی بداتە پاڵ غەیری گەورەكەی) .

**٩٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی گەورەترینی درۆكان ئەوەیە كەسێك خۆی بداتە پاڵ غەیری باوكی، هەركەسێك خۆی بداتە پاڵ غەیری باوكی یان خۆی بەری بكات لە گەورەكەی، بۆنی بەهەشت ناكات،

له كاتێكدا كه بۆنەكەی له دووری حەفتا ساڵ بۆن دەكرێ، یان پێنج سەد ساڵ) .

---

: سەبارەت بەم فەرمووودانەی سەرەوە خۆدانە پاڵ غەیری باوك كوفری بچوكە و یەكێكە لە گەورەترین تاوانەكان، بەڵام گەر بە إعتقادەوە بێت یاخوود بە یەقینەوە خۆی بداتە پاڵ غەیری باوكی یان پاڵ میللەتی ئیسلام یان پاڵ دینی رسول الله ﷺ ئەوا كوفری گەورەیە و لەدین دەری دەكات پەنا بە الله .



## باب : (٨)

## کەڕاهەتی ئەوەی هاتووە لەسەر جنێودان بە مردووان



١٠٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (جنێو مەدەن بە مردووان، ئەوان کرداری خۆیان بردووە لەگەڵ خۆیان) .

١٠١ - مسروق دەفەرمووێ : چومە لای عائیشە رضي الله عنها ئەویش گووتی : فلانە کەس چی لێهات لەعنەتی اللّٰه ی لەسەربێت .

منیش گوتم : مرد .

فەرمووی : (اللّٰه ڕەحمی پێ بکات) .

گوتم : ئەوە چۆن دەبێت .

فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (جنێو مەدەن بە مردووان) .

١٠٢ - دایکمان عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێ : (باسی مردوانتان مەکەن مەگەر بە خەیر نەبێت) .

**١٠٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (جنێو بە مردوان مەدەن چونکە زیندووەکان پێی ئەزیەت دەخۆن) .

**١٠٤** - رسول الله ﷺ قەدەغەی کرد کە قسە بە کوژراوەکانی موشریکان بدەین لە جەنگی بەدر، وە فەرمووی : (ئەوەی ئێوە دەیڵێن بەوان ناگات، وە زیندووەکانیش ئەزیەت دەدەن، بەڕاستی قسەی بەتاڵ لۆمەکراوە لە دیندا) .

**١٠٦** - إبن عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (بەسە بۆ ئەوەی ببن بە جنێو دەر کە بەسوکی باسی مردوانتان بکەن).

**١٠٧** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (دووشت هەیە کوفرە پێتانەوە شین ورۆڕۆ لەسەر مردوو، وە تانەدان لە ڕەچەڵەک) .

**١٠٩** - إبن عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : لە جاهیلیەتدا پیاوێك جنێوی بە باوکی عباس دا - **دەکاتە باپیری رسول الله** ﷺ - ئیمامی عەباسیش شەقێکی لێیدا، وە عەشیرەتی بەرامبەر چەکیان هەڵگرت، وە ئەوانیش چەکیان هەڵگرت، رسول الله ﷺ زۆر تورەبوو و چویە سەر مینبەر و فەرمووی : (من کێم؟) .

فەرمویان : تۆ رسول اللهی ﷺ .

ئينجا فەرمووی : (بەڕاستی مام دەکاتە بنەچەی باوک، جنێو بە مردوانمان مەدەن زیندوانمان ئەزیەت دەدەن) .

ئینجا خەڵکەکە گوتیان : پەنا دەگرین بە الله لە توڕەیی رسول الله ﷺ.

١١٠ - إبن عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (لە جاهیلیەتدا پیاوێك جنێوی بە باوکی عباس دا - دەکاتە باپیری رسول الله ﷺ - ئیمامی عەباسیش شەقێکی لێیدا، وە عەشیرەتی بەرامبەر گووتیان واللەی لێیدەدەینەوە هەروەک چۆن لەو کەسەی داوە، تا چەکیان هەڵگرت، ئەمەش گەیشتەوە بە رسول الله ﷺ ، ئەویش زۆر توڕەبوو و چویە سەر مینبەر و فەرمووی : (ئەی خەڵکینە لەسەر زەوی کێ بەڕێزترینی مرۆڤەکانە لە لای الله)؟

فەرمویان : تۆی .

ئینجا فەرمووی : (بەڕاستی عەباس لە منە، وە منیش لە ئەوم، جنێو بە مردووانمان مەدەن زیندوانمان ئەزیەت دەدەن) .

ئینجا خەڵکەکە کۆبونەوە و هاتن و گوتیان : پەنا دەگرین بە الله لە توڕەیی رسول الله ﷺ ، ئەی رسول الله ﷺ لێمان خۆش بە).

---

: تا کۆتایی بابەکە و ئەثەری ژمارە ١١٦ هەمان فەرموودەیە .



## باب : (٩)

# چی هاتووه دەربارەی درۆ، وە بێزراوی ئەوەی دەبێتە ئەهلی درۆ



١١٧ - أوسط ی کوڕی إسماعیل دەفەرمووێ : گوێم لە ئەبووبەکری صدیق بوو رضي الله عنه وتاری دەدا دوای وەفاتی رسول الله ﷺ فەرمووی : رسول الله ﷺ هەستا وتارمان بۆ بدات لەو شوێنەی کە منی لێم لە ساڵی یەکەم - کۆچی - ، ئینجا گریا و فەرمووی : (ئامان وریابن لە درۆ، بەڕاستی درۆ لەگەڵ خراپەکاریدایە، وە ئەو دووانەش لە ئاگردان).

١١٨ - أوسط کوڕی عمر البجلي دەفەرمووێ : چووم بۆ مەدینە بینیم ئیمامی ئەبووبەکر وتار دەدات، فەرمووی : ئەی خەڵکینە، رسول الله لەم شوێنەی منی لێم هەڵسایەوە لە ساڵی یەکەمی دوای هیجرەت، دواتر فرمێسک لە چاوەکانی هاتنە خوار لەبەر گریان نەیدەتوانی قسە بکات، سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە، دواتر فەرمووی : (داوای ساغ و سەلامەتی لە الله

بکەن، هیچ کەسێك هیچ شتێکی پێ نەبەخشراوە چاکتر بێت لە عافیەت لە دوای یەقین، ئامان ئاگاداربن لە درۆ، چونکە درۆ لەگەڵ خراپەدایە، ئەو دووانەش لە ئاگردان).

١١٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی درۆ دەروازەیەکە لە دەروازەکانی نیفاق) .

١٢٠ - حەسەنی بەصری دەفەرمووێ : (هاوەڵەکان دەیان فەرموو بەڕاستی نیفاق بریتیە لە پێچەوانە بوونی نهێنی و ئاشکرایی، وە پێچەوانە بوونی قسە و کردار، وە ناوەوە و دەرەوە، وە بنچینەی نیفاق کە نیفاقی لەسەر دەڕوێت بریتیە لە درۆ) .

١٢١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (گەورەترین خیانەت ئەوەیە کە قسەیەك بۆ برایەکت بکەی کە ئەو بەڕاستت بزانێت، وە تۆش درۆی لەگەڵ بکەی) .

١٢٢ - محمدی کوڕی ئیمامی عەلی رضي الله عنە دەفەرمووێ : (ئەوەندە بەسە کە ببێت بە سەرزەنشت بۆت لەسەر درۆکەت کە خۆت بزانیت درۆزنی) .

١٢٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەردەوام بەندە درۆ دەكات و بەدوای درۆ دەگەڕێت تا لە لای الله بەدرۆزن دەنوسرێت) .

١٢٤ - عبدالله ی كوڕی ناسح الحضرمی دەیگێڕایەوە دەیگوت كە رسول الله ﷺ تێپەڕی بەلای دوو پیاودا مامەڵەی مەڕیان دەكرد، وە سوێندیان دەخوارد، یەكێكیان گووتی : والله ی لەوەندە كەمتر ناتدەمێ، وە ئەوەی تریان گوتی والله ی لەوەندە زیاترت نادەمێ، ئیدی كابراكە مەڕەكەی كڕی، رسول الله ﷺ فەرمووی : (لەسەر یەكێكیان پێویست و واجب بوو تاوان و كەفارەت) .

١٢٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (درۆ ڕزق كەم دەكات).

١٢٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو كەسەی سوێند دەخوات بە درۆ ئەوا كاڵایەكەی ساغ دەبێتەوە، بەڵام بەرەكەت لەم پیشەیە ناهێڵێ).

١٢٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو دوو كەسەی مامەڵە دەكەن ئازادن تا جیادەبنەوە، یان تا جیانەبونەوە، كە جیابونەوە گەر ڕاستیان گووتبێ و شتەكانیان ئاشكرا كردبێ، بەرەكەت دەكەوێتە مامەڵەكەیان، گەر درۆیان كردبێ و لە یەكتریان شاردبێتەوە ،بەرەكەتی لێدەبڕێ ئەو مامەڵەیە).

١٢٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی درۆ دەروازەیەکە لە دەروازەکانی نیفاق) .

١٣٠ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (بەڕاستی بازرگانەکان فاجر و خراپەکارن) .

هاوەڵان گوتیان ئەی رسول الله ئەی الله کڕین وفرۆشتنی حەڵاڵ نەکردووە؟

فەرمووی : (با بێگومان، بەڵام لەبەرئەوەی سوێند دەخۆن و تاوانبار دەبن، وە قسە دەکەن و درۆ دەکەن).

١٣١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ کەس هەن الله قسەیان لەگەڵ ناکات لە ڕۆژی قیامەت، وە سەیریشیان ناکا، وە پاکیشیان ناکاتەوە، وە سزایەکی بە ئێشیان بۆ هەیە، منەتکار ئەو کەسەی شتێك ببەخشێ ئیلا منەت دەکات، وە ئەو کەسەی کاڵاکەی ساغ دەکاتەوە بە سوێندی درۆ، وە ئەوکەسەی جلەکانێ لە خوار قولەپێیەتی).

١٣٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هیچ سوێند خۆرێك نیە کاتێک سوێندێک دەخوات ئەگەر بێتو لە قسەکانی بەقەدەر لاباڵێکی مێشولەی تێدا هەڵە بکات، ئیلا دەبێتە نوکتەیەك بە دڵیەوە تا ڕۆژی قیامەت).

**١٣٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ كەس هەن الله قسەیان لەگەڵ ناكات لە ڕۆژی قیامەت، وە سەیریشیان ناكا، وە پاكیشیان ناكاتەوە، وە سزایەكی بە ئێشیان بۆ هەیە، ئەو كەسەی ئاو بە سەرچاوەی ئەودا دەڕوات و لە خەڵكی قەدەغە بكات، وە ئەو كەسەی لە دوای نوێژی عەسر مامەڵەیەك دەكات و سوێند دەخوات كە بەوەندە و بەمە كڕیویەتی، وە پیاوێك بەیعەت دەدات بە ئیمامێك بەس لەبەر دوونیا، ئەگەر پێی ببەخشێ وەفا بە عەهدی دەكات، گەر پێی نەبەخشێ لە دوونیا وەفا بە بەڵێنی ناكات).

**١٣٤** - إبن الأحمس دەفەرمووێ : (گەیشتم بە ئەبوو ذر گوتم : ئەی ئەبوو ذر ئەو حەدیثە كامەیە كە پێم گەیشتووە باست كردووە، ئەویش فەرمووی : ئەوە چیە بیرم نیە ئێستا خۆ درۆ لەسەر رسول الله ﷺ ناكەم، منیش گوتم ئەی ئەبوذر پێم گەیشتووە كە تۆ دەڵێی : (سێ كەس هەن الله خۆشی دەوێن و سێ كەسیش هەن الله ڕقی لێیانە) .

ئەویش فەرمووی : (بەڵێ وامگووتوە و بیستومە) .

منیش گوتم : كێن ئەو سێ كەسەی الله خۆشی دەوێن؟

فەرمووی : (پیاوێكە لە جیهاد دا لەگەڵ كۆمەڵەی موسڵمان و وەستاوە بۆ شەڕ وە پشت هەڵناكاتەوە تا یان دەكوژرێ یان سەردەكەون لەگەڵ هاوەڵەكانیدا، كەسێكیش دراوسێیەكی خراپی هەیە و ئەزیەتی دەكا

بەڵام ئەو صبری لەسەر دەگرێت تا لەیەکتر جیا دەبنەوە یان دەمرن یان یەکێکیان ماڵی دەگوازێتەوە، وە پیاوێك لە گەشت دایە یان لەگەڵ سوپایەکدایە سەفەرەکەیان درێژە دەکێشێ تا دەگەنە شوێنێك تێیدا پشوو بدەن، هاوەڵەکانی دەخەون ئەویش نوێژ دەکا تا بەیانی ئینجا بانگیان دەکات بۆ ڕۆیشتن) .

گوتم ئەی ئەو سێ کەسەی اللّٰه ڕقی لێیانە کێن؟ .

فەرمووی : (بازرگان یان فرۆشیارێك کە سوێند زۆر دەخوات، وە هەژارێکی خۆ بە گەورە زان، وە بەخیلێکی منەتکار).

**١٣٥** - عائیشە رضي اللّٰه عنها دەفەرمووێ : (رسول اللّٰه ﷺ پەنای دەگرت بە اللّٰه لە تاوان و قەرز، وە دەیفەرموو بەڕاستی ئەوەی قەرزدار بێت بەڵێن دەدات و جێبەجێی ناکات، قسە دەکات و درۆ دەکات) .

**١٣٦** - شەعبی دەفەرمووێ : (نازانم کامیان زیاتر ڕۆچێنەرن لە جەهەننەم بەخیلی یان درۆ).

**١٣٨** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (وەیل بۆ ئەو کەسەی قسەیەك دەکات و درۆ دەکات بۆ ئەوەی ئەهلی مەجلیسەکە پێبکەنن، وەیل بۆی، وەیل بۆی) .

**١٣٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی بەندە هەیە قسەیەك دەكات تەنیا بۆ ئەوەی ئەهلی مەجلیسەكە پێ بكەنن، قلْپ دەبێتەوە بۆ ئاگر بە نێوان دووری ئاسمان و زەوی).

**١٤٠** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لەخەودا بینیم وەك ئەوەی كابرایەك هات پێی گوتم هەستە، منیش هەڵسام لەگەڵی، دوو كەسمان بینی یەكێكیان وەستابوو ئەویتر دانیشتبوو، ئەوەی بە پێوە وەستابوو قولابێكی ئاسنی پێبوو، قولابەكەی گیركردبوو لە نێوانی دەمی ئەو كەسەی دانیشتبوو، وە لە هەردووك لا گیری كردبوو، لایەكی لێوی دەدڕاند،ئینجا دەچوو لایەكی تری دەدڕاند، تا ئەمەی دووەمی دەدڕاند ئەوەی یەكەم چاك دەبویەوە دووبارە بە هەمان شێوە، منیش بەم كەسەم گووت كە منی بردبوو، ئەوەچیە؟

گووتی: ئەوە كەسێكی درۆزنە لە گۆڕەكەی سزا دەدرێت تا رۆژی قیامەت).

**١٤١** - لە عبدالله ی كوڕی جراد ەوە رضي الله عنە دەفەرمووێ : پرسیارم كرد لە رسول الله ﷺ گووتم : ئەی رسول الله ئایا ئیماندار زینا دەكات؟

فەرمووی : (دەكرێ توشی ببێت) .

گوتم ئەی رسول الله ئایا ئیماندار دزی دەكات؟

فەرمووی : (دەکرێ توشی ببێت) .

گوتم ئەی رسول الله ئیماندار درۆ دەکات؟

فەرمووی : نەخێر، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە | إِنَّمَا يَفْتَرِي ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ ٱللَّهِ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ | [النَّحلِ: ١٠٥]

واتا : (بەڕاستی هەر ئەوانە درۆ دەکەن کە باوەڕیان نیە بە ئایاتەکانی الله وە ئەوانە درۆزنن).

**١٤٣** - ئەبووبەکری صدیق رضی الله عنه دەفەرمووێ : (خۆتان بپارێزن لە درۆ، چونکە درۆ لابەری ئیمانە، **- دژبە ئیمانە -** ) .

**١٤٤** - رسول الله ﷺ دووعای دەکرد و دەیفەرموو: (اللهم دڵم پاك بکەیتەوە لە نیفاق، وە دامێنم لە زینا، وە زمانم لە درۆ) .

**١٤٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ کەس هەن الله ﷻ قسەیان لەگەڵ ناکات، و سەیریان ناکات، و پاکیان ناکاتەوە و سزای زۆر بە ئێشیان بۆ هەیە، پیرێکی زیناکار، دەسەڵاتدارێکی درۆزن، وە فەقیرێکی خۆ بەگەورەزان) .

**١٤٦** - مەیمونی کوڕی مهران دەفەرمووێ : (الله سوێند دەخوات بە ویستی خۆی لە هەرشتێك خەلقی کردووە، وە بۆ هیچ کەس درووست نیە سوێند

بخوات تەنیا بە الله نەبێت، وە هەر کەسێك سوێندی خوارد بە الله با درۆ نەکات، پێم گەیشتووە کە الله لە پەڕاوەکانی بۆ موسا بۆی نوسیبوو لە تەوراتدا : سوێند بە من مەخۆ بە درۆ، چونکە من کرداری هیچ کەس باش ناکەم و تەزکیەی ناکەم کە سوێند بەمن دەخوات بەدرۆ).

**١٤٧** - مەیمونی کوڕی مهران دەفەرمووێ : (هەر کەسێك سوێند بەخوات لەسەر ، وە بشزانێت کاتێك سوێندەکە دەخوات درۆ دەکات، ئەوە موونافیقە).

**١٤٨** - حەسەنی بەصری دەفەرمووێ : (درۆ کۆکەرەوەی نیفاقە) .

**١٤٩** - إیاسی کوڕی معاویەی کوڕی قرة : (من پێم خۆش نیە درۆیەك بکەم کەس ئاگای لێ نەبێت جگە لەباوکم، پێم خۆش نیە هەموو دونیام بدەنێ بە جوانیەکانیەوە لەسەر ئەو درۆیە کە بیکەم).

**١٥٠** - عبداللهی کوڕی عامر دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ هات بۆ ماڵمان، وە منیش منداڵ بووم چوم یاری بکەم، دایکم بانگی کردم گوتی : ئەی عبدالله وەرە شتێکت بدەمێ .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (دەتەوێ چی بدەیتێ؟)

دایکم گوتی : دەمەوێ خورمایەکی بدەمێ .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەگەر وات نەکردبایە و هیچت پێی نەدابوایە ئەوا بە درۆ لەسەرت دەنوسرا).

**١٥١** - پیاوێك هات بۆ لای عبدالله ی کوڕی مسعود رضی الله عنه و گووتی : چەند وشەیەکم فێربکە کۆکراوەی شتە بەسوودەکان بێت، عبدالله فەرمووی : (الله بپەرستە و شەریکی بۆ قەرار مەدە، وە لەگەڵ قورئان بە لەکوێ بوو لەوێبە - و اتا ئەمرەکانی قورئان - ، وە هەرکەسێك ڕاستی و حەق بۆ هێنایت لە بچوك یان گەورە گەر چی دووربێت و لات بوغزراو بێت لێی وەربگرە، وە هەرکێ درۆی بۆ هێنای گەرچی کەسەکە خۆشەویستت بێت و نزیکت بێت ڕەتی بکەوە و بەچاوی دابدەوە) .

**١٥٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ کردەوە هەیە هی موونافیقە، کاتێك بەڵێنی دا پێچەوانەی دەکات، کاتێ ئەمانەتێکی درا دەست خیانەتی لێدەکات، وە کاتێ قسەی کرد درۆ دەکا).

**١٥٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (نیشانەکانی موونافیق سێ دانەن، کاتێك قسەی کرد درۆ دەکات، کە بەڵێنی دا پێچەوانەی دەکات، وە کاتێك ئەمانەتی پێدرا خیانەتی لێدەکات، ئینجا فەرمووی : بە ڕاست دانەری ئەمانەش لە قورئاندا هەیە | إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ | (**المُنَافِقُونَ : ١**) .

واتا : (كاتێک دوو ڕووەکان هاتن بۆلات ئەی رسول اللّٰه ﷺ! ئەڵێن : شایەتی دەدەین کە بەراستی تۆ رسول اللّٰه یت، لە حاڵێکدا اللّٰه خۆی دەزانێ کە تۆ نێردراوی ئەویت، وە اللّٰه شاهێدی دەدات کە ئەو دووڕووانە درۆ دەکەن).

وە دەفەرمووێ : ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ [**التَّوبَةِ** : ٧٥]

واتا : (هێندێک لە دوو ڕووەکان پەیمانیان لەگەڵ اللّٰه بەست وگوتیان : مەرج بێت ئەگەر اللّٰه ماڵ و ڕۆزییمان بداتێ، خێرو صەدەقە بکەین و بچینە ڕیزی پیاوچاکانەوە،تا ئایەتی ٧٧) .

وە دەفەرمووێ : ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾ (**الأَحزَابِ** : ٧٢)

**١٥٤** - رسول اللّٰه ﷺ فەرموویەتی : (ئەگەر اللّٰه فەیئم پێ ببەخشێ بەقەدەر گەڵای ئەو دارانە، ئەوا هەمووی بەش دەکەم لە نێوانتان، وە نام بینن بەخیل بم، وە ترسنۆك بم، وە درۆ بکەم).

---

: فەیء : و اتا دەست کەوتێك بە بێ جەنگ کەوتبێتە دەست موسڵمانان .

**١٥٥** - عمری كوڕی عبدالعزیز نامەی بۆ بەشێك لە ئەمیر و كرێكارەكان نارد و فەرمووی : (ئامان وریابە نەكەی پشت بە درۆزن ببەستی، چونكە گەر گوێڕایەڵی درۆزنت كرد - **بەدوای كەوتی** - ئەوا بە هیلاك دەچیت).

**١٥٦** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر یەك لە ئێوە قسەی كرد با درۆ نەكات، وە كە بەڵێنی دا با پێچەوانەی نەكات).

**١٥٧** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (چوار نیشانە لە هەر كەسێكدا بێت ئەوا موونافیقە، وە گەر هاتوو یەكێك لەمانەی تێدابوو ئەوا بەشێكی لە نیفاق تێدایە تا وازی لێدێنێ، ئەوەی كاتێك قسە دەكات درۆ دەكات، وە كە بەڵێنی دا پێچەوانەی دەكات، وە كە عەهدی دا غەدری لێدەكا، وە كاتێك موناقەشە دەكات سنور دەبەزێنێ) .

**١٥٨** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ شت هەیە لە هەركەسێكدا بێت ئەوا موونافقە، گەر دانەیەكی تێدابێت بەشێک لە نیفاقی تێدایە تا وازی لێدێنێ، ئەگەر قسەی كرد درۆ دەكات، وە كە وەعدی دا پێچەوانەی دەكات ، وە كە ئەمانەتێكی پێدرا خیانەتی لێدەكات).

---

**: و اتا كاتێك بەربەرەكانێ يان موناقەشەيەك درووست دەبێت ئەم مونافيقە لە شوێنێكی تربۆت پازدەدات وبۆت دێت، بۆنموونە تۆ دەڵێی ئەم شتە بيدعەيە دەڵێ ئەی ئەوە چی باسەكە دەگۆڕێ .**

**١٥٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەركەسێک سوێندێك بخوات بەدرۆ بۆ ئەوەی شتێك بكات بە حەقی خۆی و بيخوا با جێگای خۆی خۆش بكات لەناو ئاگر).

**١٦٠** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ نيشانە هەيە لە هەر كەسێكدا بێت ئەوا مونافيقە گەرچی بەڕۆژوو بێت و نوێژ بكات وە بڵێ من موسڵمانم، ئەو كەسەی ئەمانەتی پێدرا خيانەت بكات، وە كە قسەی كرد درۆ بكات، وە كە وەعدی دا جێبەجێی نەكات).

**١٦١** - عبدالله ی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : (ئامان وريابن لە درۆ، چونكە ڕێنمويی دەكات بۆ خراپە، وە خراپەش ڕێنمويی دەكات بۆ ئاگر، بەردەوام بەندە درۆ دەكات تا بە درۆزن دەنوسرێت، وايلێدێ شوێنێكی نامێنێ بۆ ئەوەی چاكەی تێ بچێت).

**١٦٢** - عبدالله ی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : (ئامان وريابن لە درۆ، چونكە ئەوە ڕێنمويی دەكات بۆ خراپە، وە خراپەش ڕێنمويی دەكات

بۆ ئاگر، بەردەوام بەندە درۆ دەكات تا بە درۆزن دەنوسرێت،وایلێدێ شوێنێک لەناو دڵی نامێنێ کە چاکەیەکی تێبچێت).

١٦٣ - ئیمامی عومەری کوڕی خطاب رضي الله عنه دەفەرمووێ : (هەڵمەخەڵەتێن بە نوێژی کەسێك، وە نە بە ڕۆژوو گرتنیشی، بەڵکو کە قسەی کرد درۆی کرد، وە ئەمانەتی پێدرا خیانەتی کرد ئەوە گرنگە).

١٦٤ - رسول الله ﷺ شانی دادابویەوە و فەرمووی : (ئایا ئاگادارتان بکەمەوە لە گەورەترینی تاوانە گەورەکان، هاوبەش بڕیاردان بۆ الله، وە نەدانی مافی دایک و باوك) .

دواتر شانی ڕاست کردەوە و دانیشت و فەرمووی : (شایەتی درۆ - یان قسەی درۆ - ) .

١٦٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو کاتەی بەندە درۆیەك دەکات، فریشتەکان لێی دووردەکەونەوە بە ماوەی میلێك لەبەر ئەو بۆنە ناخۆشەی درۆیەکەی).

١٦٦ - مطرفی کوڕی عبدالله دەفەرمووێ : (بەڕاستی پیاو هەیە دوو جار درۆ دەکات، گوتیان؟ ئەوە چۆن؟

فەرمووی : دەڵێ هیچ نیە ئیلا ئەوەیە، هیچ شتێك نیە) .

---

: و اتا درۆیەك دەكات بۆ ئەوەی ئەو درۆیەی ئاشكرا نەبێت درۆیەكی تر دەكات.

١٦٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئێوە شەش شت لەمن وەربگرن و بەقسەم بکەن، ئەوە گرێنتی بەهەشتتان بۆ دەکەم)

فەرموویان : ئەوانە چین؟

فەرمووی : (ئەگەر یەکێکتان قسەیەکی کرد با درۆ نەکات، وە کاتێک بەڵێنێکی دا با پێچەوانەی نەکات، وە کاتێک ئەمانەتێکی پێدرا خیانەتی لێنەکات، وە چاوتان بگرن - بپارێزن - ، وە دەستتان بگرنەوە - لە شەڕ- ، وە داوێنتان بپارێزن).

١٦٨ - زاذان ی ئەبوو عەمر دەفەرمووێ : ئیمامی عەلی رضي الله عنه هەموو بەیانیەك دەچوو بۆ بازاڕ، وە كۆمەڵێك خەڵكی فارس ی لێبوو، ئەویش دەیفەرموو : السلام علیکم، ئەی کۆمەڵانی بازرگانەکان، ئامان وریابن لە سوێند خواردن، بەڕاستی سوێند کاڵاکەت ساغ دەکاتەوە، بەڵام بەرەکەت ناهێڵێ، وە بازرگانەکان خراپەکارن ئیلا ئەوەی حەق وەربگرێ و بە حەق بیداتەوە، دواتر دەڕۆیشت، وە دەیگووت السلام علیکم، کاتێک فارسەکان دەیانبینی دەیانگوت دیسان جسم گەورەکە هاتەوە) .

---

: چونکە ئیمامی عەلی باڵا و لەشی پڕبووە مەبەستیان ئەمەیە .

**١٦٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی شەیطان کلی چاوی، وە لیکی دەمی، وەهەناسەی ناخۆشی هەیە، لیکی دەمەکەی بریتیە لە درۆ، وە هەناسەکەی توڕەییە، وە کلی چاوی بریتیە لە خەو).

**١٧٠** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی شەیطان کلی چاوی، و لیکی دەمی، وەهەناسەی ناخۆشی هەیە، لیکی دەمەکەی بریتیە لە درۆ، وە هەناسەکەی توڕەییە، وە کلی چاوی بریتیە لە خەو).

**١٧١** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەی خەڵکینە، چی وایکردووە هێندە دوای درۆ بکەون، هەر وەك چۆن پەپوولە ڕادەکات لە ئاگر - دەسوڕێتەوە - ) .

**١٧٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەی خەڵکینە، چی وایکردووە هێندە دوای درۆ بکەون، هەر وەك چۆن پەپوولە ڕادەکات لە ئاگر - دەسوڕێتەوە - ، هەموو درۆیەك ئیلا دەنوسرێت بە درۆ لەسەرتان، ئیلا مەگەر یەکێك درۆیەك بکا لە جیهاد دا، چونکە جەنگ فێڵە، یاخوود لە نێوان دوو کەس ناکۆکی هەبێت ئەویش ئاشتیان بکاتەوە، یاخود درۆیەك بۆ ئافرەتەکەی بکا بۆ ئەوەی ڕازی بکات).

**١٧٣** - جابری کوڕی سمرە رضي الله عنه دەفەرمووێ : عمری کوڕی خطاب وتاری بۆ داین لە الجابیة - شارێکە لە سوریا - فەرمووی بەڕاستی رسول

الله ﷺ بەم شێوەیە وەستا کە من وەستاوم ئینجا پێی فەرموین : واتا رسول الله ﷺ فەرمووی : (چاك بن لەگەڵ هاوەڵانم، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، ئینجا دواتر درۆ بڵاو دەبێتەوە، تا وایلێدێت پیاو سوێند دەخوات بێ ئەوەی سوێند درابێت، وە شاهێدی دەدات، بێ ئەوەی داواى لێکرابێت) .

---

**: باش بوون لەگەڵ هاوەڵان ئەوەیە وەك ئەوان ئیمان بێنین و تێبگەین لە دینی ئیسلام چونکە ئەوە الله ئەمری کردوە پێمان، وە بەرگریان لێبکەین ئەوەش ئایەتە و بەرگریان لێبکەین، برِو انە السنةی ئیمامی الخلال.**

١٧٥ - (عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه دەستی کرد بە وتار دان لە شاری الجابية و حەمد و سوپاسی الله ی کرد، وە ستایشی الله ی کرد بەو جۆرەی کە شایانیەتی، ئینجا فەرمووی **- وەکو ئەثەری پێشتر -** ) .

١٧٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەس قسەیەك بکات وە بزانێت کە ئەو قسە درۆیە، ئەوە یەکێکە لە درۆزنەکان).

١٧٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەس قسەیەك بکات وە بزانێت کە ئەو قسە درۆیە، ئەوە یەکێکە لە درۆزنەکان) .

١٧٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر كەس قسەیەك لەمن بگێڕێتەوە وە بزانێت كە ئەو حەدیثە - قسەیە - درۆیە، ئەوە یەكێكە لە درۆزنەكان).

١٧٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر كەسێك سوێندێك بخوات بە تاوان بە درۆیەك، بۆ ئەوەی ماڵی موسڵمانێك بخوات یان ببڕێت بە بێ ئەوەی حەقی خۆی بێت، دەگاتەوە بە الله ئەو كاتەی پێی دەگاتەوە-قیامەت- ئەوا الله لێی توڕەیە) .

١٨٠ - عبدالله ی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : (شایەتی دانی درۆ یەكسانە بە شیرك ئینجا ئەم ئایەتەی خوێند | وَٱجۡتَنِبُواْ قَوۡلَ ٱلزُّورِ * حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيۡرَ مُشۡرِكِينَ بِهِۦ |

١٨١ - طارق كوڕی شهاب دەفەرمووێ : پیاوێك قسەی لەگەڵ ئیمامی عومەر دەكرد، قسەیەكی درۆی تێدا كرد، ئیمامی عومەر فەرمووی : ئەم قسەیە بگەڕێنەوە - و اتا وەرناگرم - .

قسەیەكی تری كرد و درۆیەكی تێدا كرد، ئیمامی عومەر دیسان فەرمووی : ئەم قسەیە بگەڕێنەوە .

پیاوەكەش گووتی : هەموو ئەوانەی بۆم باس كردی حەق بوو، ئیلا جگە لەوانەی گووتت بیانگەڕێنەوە).

---

: سبحان الله له زيرەكی و ئاقڵی ئیماندار

**١٨٢** - رەبیعی کوڕی خوثەیم رحمه الله دەفەرمووێ : (قسە هەیە لەناو قسەکان کە ڕوناکی پێوەیە وەك ڕۆژی ڕووناك دیارە، وە قسەش هەیە لەناو قسەکان کە تاریکە وەك شەوی تاریك دیارە کە درۆیە) .



# باب : (١٠)

## بابی خۆپەنادانی پیاو لە درۆکردن بە المعاریض

**المعاریض : واتا قسەیەك بكەی دوو مانای هەبێت .**



**١٨٣** - مطرفی کوڕی عبدالله دەفەرمووێ : (هاوەڵێتی عمران ی کوڕی حصینم کرد رضي الله عنه لە شاری الرقة بۆ بەصرە، هیچ ڕۆژێکمان بەسەرنەهات ئیلا شعرێکی بۆ دەگوتین، وە فەرمووی: بەڕاستی المعاریض ڕزگارکەرە لە درۆ) .

**١٨٤** - مطرفی کوڕی عبدالله دەفەرمووێ : (بەڕاستی المعاریض بێ نیازت دەکات لە درۆ) .

**١٨٥** - سعیدی کوڕی أبي هلال دەفەرمووێ : کە قرة ی کوڕی هبیرة ی العامري چوە لای رسول الله ﷺ، وە ئیمانی هێنا، کاتێك گەیشتە ساڵی حەجی

ماڵئاوایی، رسول الله ﷺ سەیری کرد وە ئەویش لەسەر وشترێکی بچوك بوو، فەرمووی : (ئەی قرة) .

خەڵکەکە بانگیان کرد ئەی قرة، ئەویش هات بۆ لای رسول الله ﷺ، رسول الله ﷺ پێی فەرموو : (ئەی قرة چیت پێگووتم کاتێك هاتی موسڵمان بووی) .

ئەویش گووتی : گووتم ئەی رسول الله ﷺ، ئێمە چەند خودایەکمان هەبوو لە نێر و مێ دەمانپەرستن جگە لە اللە، لێیان دەپاڕاینەوە و جوابیان نەدەدایەوە، وە داوامان لێدەکردن پێیان نەدەبەخشین، کە اللە تۆی بۆ ناردین و وازمان لەو خوایە بەتاڵانە هێنا، دواتر ڕۆیشت و پشتی کردەوە .

رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : ( بەڕاستی سەرفرازە ئەو کەسەی ڕزقی ئەقڵی پێدراوە) .

وە دواتر رسول الله ﷺ عمری کوڕی عاص دەنێرێ بۆ البحرین، دواتر رسول الله ﷺ وەفات دەکات و عەمری کوڕی عاصیش هێشتا لەوێ بوو و نەگەڕابویەوە .

عەمری کوڕی عاص دەفەرمووێ : ڕۆیشتم تا گەیشتمە لای موسەیلەمەی کذاب، ئەمان ی بەمن دا .

دواتر پێی گووتم : بەڕاستی محمد نێردرابوو بۆ شتە گەورەکانی دین، منیش نێردراوم بۆ شتە بچووکەکان .

منیش گووتم : شتێکم نیشان بدە لەوەی وا دەیڵێی .

موسەیلەمە گوتی : ئەی بۆقەکە خۆت خاوێن بکەوە بەم شێوە زۆر باش دەبێت، کەس لێت ڕاناکا، وە ئاوەکەش پیس ناکەی، ئینجا گوتی ئەی الوبر[1] دوو دەست و سینگێك، وە ئەوەی تریشت هەمووی زبرە .

ئینجا دوو کۆمەڵە هاتن بۆ لای موسەیلەمە کە کێشەیان هەبوو لەسەر دار خورما، کۆمەڵێک دار خورمای کۆمەڵێکی تریان بڕیبوو، ئەویش سەرچەفێکی هەبوو بەسەری خۆی دادا، ئینجا لە سەر سەری خۆی لادا و گوتی : سوێند بەو شەوە تاریکە، سوێند بەو گورگە گەورەیە، قەومی باوکی موسلیم خۆی دوورنەخستۆتە لەو شتە حەرامە، ئینجا دووبارە سەری خۆی داپۆشی و گووتی : سوێند بەو شەوە داپۆشەرە، سوێند بەو گورگە تەنگە نەفەسە، ئەو دار خورمایە بە تەڕی و بە وشکی هەر وەك یەکە، ئەوجا گووتی هەستن بڕۆن باسەکەتان هیچ کێشەی تێدانیە .

عەمر دەفەرمووێ : منیش گووتم : واللە ﺑﻬی تۆ خۆت ئەوە دەزانی کە درۆ دەکەی، ئەویش هەڕەشەی لێکردم،

ئینجا گوتی : ئەی قرة ی کوڕی هبیرە، هاوەڵەکەتان چی لێهات؟ **- مەبەستی رسول الله یە ﷺ -**

منیش گووتم : بەڕاستی اللّٰه هەڵبژاردەی پێدا لەوەی کە بیباتەوە بۆ لای خۆی یان لەلای ئێمە بێت ئەویش لای اللّٰه ی هەڵبژارد و وەفاتی کرد .

گوتم : بەڕاستی من لە مەودوا باوەڕ بە هیچتان ناکەم، منیش گەیشتم بە خالیدی کوڕی وەلید، پرسیارم لێی کرد کە بمنێرن بۆ لای قەومەکەی، لەبەر ئەو شتەی کە لێم بیستبوو، چوم بۆ لای، کتێبەکەم دەرهێنا ئەوەی کە ئیمامی ئەبووبەکر ناردبووی وا نوسرابوو کەمن زەکاتەکەم داوە و **- مورتەد نەبوومەوە -** .

منیش پێم گووت **- عەمری کوڕی عاص بە قرة ی گووت -** : بۆچی ئەم قسەیەت کردووە؟؟

ئەویش فەرمووی : من ماڵ ومنداڵم هەیە، ترسام شتێکیان لێ بەسەر بێت، وە من لەم قسەیەم کە کردم ئەوە نیازم بوو کە لەمەودوا لە دوای پێغەمبەر محمد ﷺ بڕوا بەکەس ناکەم بڵێ من پێغەمبەرم) .

---

**: الوبر: ئاژەڵێکە لە شێوەی سمۆرە نزیکە .**

**تەبعەن ئەم ئەثەرە بەشێکی لاوازە بەڵام شاهێدی باسەکەمانە، گەربڕو انین لە ئەوەڵی ئەثەرەکە رسول اللّٰه بە قرة دەفەرمووێ سەرفرازە ئەوەی ئەقڵی پێ بەخشراوە، جا ئەقڵەکەی لێرە دیاردەکەوێت کە لە موسەیلەمە خۆی ڕزگار دەکات بەو قسەیە ، تۆزێک ورد ببنەوە لە بابەتەکە حاڵی دەبن قوڕس نییە .**

سەبارەت بەم باسە ئەمە شتێکی زۆر گرنگە بۆ موسڵمانە کە خۆی پێ دەربازبکات لەوەی توشی درۆ نەبێت و توشی زەرەرێکی دونیایی و قیامەتی نەبێت، بەڵام زۆر بەکارهێنانی درووست نیە ، وە بۆ فێڵ و تەڵەکە و خیانەت و ئەوشتانە درووست نیە وحەڕامە، وە ئەم المعاریضە یەکێک لە ئیمامەکانی سەلەف دەفەرمووێ نیوەی ئەقڵە، وە خودی هاوەڵان و رسول اللە ش بەکاریان هێناوە بەنمونە : کاتێک ئیمامی ئەبووبەکر و رسول اللە ﷺ هیجرەت دەکەن یەکێک دەپرسێت ئەی ئەبووبەکر ئەوە کێیە: ئەویش دەفەرمووێ هذا الرجل يهديني إلى السبيل و اتا ئەوە ڕێنموویيم دەکات بۆ ڕێگاکە، کابرا و ایز انی مەبەستی ئەوەیە شارەزای ڕێگایە بەڵام ئیمامی ئەبووبەکر مەبەستی ڕێگای بەهەشت بوو وەرسول اللە ﷺ یش ئیقراری پێکرد .

کاتێک دەردەچن بۆ جەنگی بەدر لە پیاوێک دەپرسن کە ئایا قوڕەیش خەریکی چین، کابرا دەڵێ پێم بڵێن لەکام هۆزەن ئینجا پێتان دەڵێم ئەویش فەرمووی لە (ئاو) کابراش و ایز انی مەبەستی ئەو انەیە لەدەوروبەری ئاوەکان نیشتەجێن .

١٨٦ - ئیمامی عەلی رضي اللە عنە دەفەرمووێ : (ئەگەر هیچ کەس نەچێتە بەهەشت ئیلا ئەوەی ئیمامی عثمانی کوشتووە ئەوە منیش ناچم، وە ئەگەر هیچ کەس نەچێتە ئاگر ئیلا ئەوەی کوشتویەتی ئەوە منیش ناچم، خەڵکەکە کردیە دەنگە دەنگ و هەرا .

ئەوجار فەرمووی : بەڕاستی زۆرتان بۆ هێناوم ئەی خەڵکینە، اللە ﷻ ئیمامی عوثمانی بۆلای خۆی بردەوە و منیش لەگەڵیا .

ئیمامی إبن عباس و عباد دەفەرموون: مەبەستی ئەوەیە منیش وەك ئەو ڕۆحم دەكێشرێ و دەمرم) .

**١٨٧** - ئەبوو حمزة دەڵێ گوێم لەم قسەیەی ئیمامی عەلی بوو كە فەرموویەتی : الله ﷻ ئیمامی عثمانی بۆلای خۆی بردەوە و منیش لەگەڵیدا .

بۆ إبن عباس م باس كرد فەرمووی : ڕاست دەكات، الله ﷻ ڕۆحی كێشا و وە منیش دەكوژرێم وەك ئەو) .

**١٨٨** - ئیمامی عمر رضي الله عنه معاذی كوڕی جبلی نارد بۆ بەنی كلاب یان بەنی سەعدی كوڕی دینار بۆ ئەوەی فەيء یان بەسەر دابەش بكات، ئەویش دابەشی كرد هەتا هیچی لێ نەپەڕاند، تەنیا ئەو تورەگەیە مابوو كە كردبوویە بەر گەردنی و ماڵەكەی دابەش كردبوو، یان ئەو تورەگەیەی سەر وشترەكەی، ئینجا چویەوە ماڵەوە وئەوەی لەلا بوو خێزانەكەشی گووتی : كوا چیت هێناوەتەوە بۆ خۆمان - **چونكە معاذ لە بەنی سەعد بوو** - .

معاذ فەرمووی : بەڕاستی من چاودێرم لەسەر بوو .

خێزانەكەی گوتی : تۆ لە لای رسول الله ﷺ جێگای متمانە بووی وە لەلای ئەبوو بەكر ئەمین بووی، بەڵام عمر تۆی ناردووە و چاودێری لەسەر داناوی ؟، هەستا لای خێزانەكانی ئیمامی عومەر شكاتی كرد لە عومەر، ئەوەیش

گەیشتەوە ئیمامی عومەر، ئیمامی عومەر یش بانگی معاذی کرد و پێی فەرموو : (ئایا من چاودێرم لەگەڵ تۆ ناردووە؟)

معاذ فەرمووی : واللەهی هیچم نەدۆزیەوە بیکەمە بیانوو ئیلا ئەوە نەبێت، ئیمامی عومەر پێکەنی، شتێکیشی پێبەخشی، فەرمووی بڕۆ خێزانەکەت بەمە ڕازی بکە .

حجاج دەفەرمووێ کە إبن جریج فەرمویەتی : وە من دەڵێم کە گووتویەتی چاودێرم لەگەڵ بوو مەبەست پێی الله یە ﷻ) .



# باب : (١١)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕووخسەت بۆ درۆ



**١٨٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (درۆزن نیە ئەو کەسەی نێوانی دوو کەس باش دەکاتەوە، خێرێك دەڵێت، وە خێرێك دەگەیەنێ بەوەی تر).

**١٩٠** - عن أم سلمة - عن رسول الله ﷺ هەمان ئەثەر

**١٩١** - عن أم سلمة - عن رسول الله ﷺ هەمان ئەثەر

**١٩٢** - عن أم سلمة - عن رسول الله ﷺ هەمان ئەثەر

**١٩٣** - أم كلثوم رضي الله عنها دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (درۆزن نیە ئەو کەسەی نێوانی دوو کەس باش دەکاتەوە، خێرێك دەڵێت، وە خێرێك دەگەیەنێ بەوەی تر) .

أم سلمة فەرمووی : نەمبیستووە رسول الله ﷺ مۆڵەت بدا لە درۆ کردن جگە لە سێ شت : لە جەنگ، وە ئاشتەوایی کردن لە نێوان خەڵکی، وە قسەی پیاو بۆ ئافرەتەکەی، وە قسەی ئافرەتیش بۆ پیاوەکەی) .

**١٩٤** - عن أم سلمة - عن رسول الله ﷺ هەمان ئەثەر .

**١٩٥** - أم سلمة دەفەرمووێ : گوێم لێنەبووە رسول الله ﷺ مۆڵەت بدا لە درۆ کردن جگە لە سێ شت : پیاوێك قسەیەك دەکات بۆ ئاشتەوایی نێوان خەڵک، وە پیاو قسەیەك دەکات لە جەنگ، وە قسەی پیاو بۆ ئافرەتەکەی، وە قسەی ئافرەتیش بۆ پیاوەکەی .

**١٩٦** - إبن أبي عروة ی الدؤلي لە کاتی خیلافەتی ئیمامی عومەر وا ناوبانگی دەرکردبوو کە خلع بە ئافرەتان دەکات کە زەواجیان لەگەڵ دەکا، ئەمەش گەیشتەوە بە خۆی و زۆر پێی ناخۆش بوو کە خەڵک وا قسە دەکات، کە زانی باسێکی وا هەیە، هەڵسا و عبداللە ی کوڕی ئەرقەمی گرت و بردی بۆماڵەکەی خۆی، بەخێزانەکەی خۆی گووت و ابن الأرقم یش گوێی لێبوو : گوتی : سوێندت دەدەم بە الله ئایا ڕقت لە من دەبێتەوە .

ئافرەتەکەشی گوتی : سوێندم مەدە .

ئەویش گوتی : با سوێندت دەدەم .

ئەویش گوتی : اللهم بەڵێ .

ئینجا إبن أبی عروة بە عبداللە ی فەرموو ئایا گوێت لێبوو؟ ئینجا ڕۆیشتن تا گەیشتن بە ئیمامی عومەر، فەرمووی : ئەی ئەمیری باوەڕداران، خەڵك دەڵێن کە من زوڵم لە ئافرەتان دەکەم، وە توشی خلعیان دەکەم، لە عبداللە ی کوڕی الأرقم بپرسە کە ئەوەی گوێی لێبوو لە ئافرەتەکەم، ئیمامی عومەر لە عبداللە ی پرسی، ئەویش هەواڵی پێی دا، ئیمامی عومەر ناردی بە دوای ئافرەتەکەی و پێی فەرموو : ئەوە تۆی کە گوتوتە بە هاوسەرەکەت کە ڕقت لێیەتی؟

ئافرەتەکە گوتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من یەکەم کەسم تەوبە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای ئەمری اللە چیە پێم بڵێن، بەڵام ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەو منی سوێند دا، منیش نەم دەویست درۆ بکەم، ئایا درۆم بکردبوایە ئەی ئەمیری باوەڕداران؟

ئیمامی عومەر فەرمووی : بەڵێ، درۆت بکردبوایە، ئەگەر هاتوو یەکێکتان ئەوی تریانی خۆش نەویست با هەواڵی پێنەدات بەوە، چونکە کەمترینی ماڵەکان لەسەر خۆشەویستی بنیاد نراون، بەڵکو مرۆڤەکان بە ئیسلام و چاکەکاری بەیەك دەگەن) [١] .

خلع : و اتا ئافرەت خۆی داوای طلاق بکات وبلێ مارەییم ناوێت تەلاقم بدە ، ئەمەش لە دینی ئێمە حەڕامە چونکە رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (أيما امرأة سألت زوجها الطلاق من غيرما بأس فحرام عليها رائحة الجنة) .

(هەر ئافرەتێك داوای تەلاق بکات لە پیاوەکەی بەبێ ئەوەی هیچ کێشەیەکیان هەبێت، حەڕامە لەسەری بۆنی بەهەشت بکات) .

وە لە حەدیثێکی تردا دەفەرمووێ : (وَإِنَّ المُخْتَلِعَاتِ والمنتزعاتِ)، (ئەوانەی خەلع دەکەن موونافیقن) .

(١) و اتا حسابی ئەوە بکەن کە حەقی ئیسلامەتیمان بەسەر یەکتر هەیە و دەبێ مافەکانی هاوسەرگیری و مافەکانی منداڵ و تێکەڵی بپارێزین، وە چاکە بکەین و ئارام بگرین لەسەریەکتری .

گەر سەیرتان کردبێ ئەم بابە و بابی پێشووتر ڕەوشتی جوان بوون بەڵام لەم کتێبە باسکراوە بۆچی؟

١ - بۆئەوەی خەڵکی کە معاریض یان درۆی ئاشتی کرد خەڵک نەڵێت ڕەوشتی ناشیرینە .

٢ - بۆئەوەی خەڵک ئەم بابەتانە بەلاڕێدا نەبات . . . الله أعلم، والحمدلله رب العالمين

١٩٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەی خەڵکینە، چی وایکردووە هێندە دوای درۆ بکەون، هەر وەك چۆن پەپوولە ڕادەکات لە ئاگر -دەسوڕێتەوە - ، هەموو درۆیەك ئیلا دەنوسرێت بە درۆ لەسەرتان، ئیلا مەگەر یەکێك درۆیەك بکا لە جیهاد دا، چونکە جەنگ فێڵە، یاخوود لە نێوان دوو کەس

ناكۆكی هەبێت ئەویش ئاشتیان بكاتەوە، یاخود درۆیەك بۆ ئافرەتەكەی بكا بۆ ئەوەی ڕازی بكات) .



# باب : (١٢)

# چی هاتووه دەربارەی کەڕاهەتی غەیبەت



**١٩٨** - ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه دەفەرمووێ : (عەرەب کاتێك دەچون بۆ گەشت بەنۆرە یەکێکیان خزمەتی ئەوانی تری دەکرد، وە پیاوێکیش لەگەڵ ئیمامی ئەبوبەکر و عمر دابوو خزمەتی دەکردن، خەویان لێکەوتبوو، کە هەڵسان خواردن ئامادە نەبوو، ئەبوبەکر وعومەر رضي الله عنهما ووتیان : سەیربکە دەڵێی لەماڵی باوکی خەوی لێکەوتووە .

ئینجا هەڵیان ستاند .

گووتیان : بڕۆ بۆ لای رسول الله ﷺ، بڵێ ئەبووبەکر و عومەر سەلامیان هەبوو بۆت .

گووتیان : گەر بکرێ خواردنمان بداتێ .

ئەویش چوو .

رسول الله ﷺ پێی فەرموو : (بڕۆ هەواڵیان پێبدە کە ئەوان خواردنیان خواردووە) .

ئەوانیش ڕاچڵەکان و چوونە لای رسول الله و ووتیان : ئەی رسول الله ﷺ ئێمە ناردبومان بۆ خواردن، بەڵام تۆ فەرمووت کە نانمان خواردووە، بەچی نانمان خواردووە؟

رسول الله ﷺ فەرمووی : (بە خواردنی گۆشتی براکەتان، من گۆشتەکەی ئەو دەبینم لە نێوان ددانەکانتان) .

گووتیان ئەی رسول الله ﷺ لێمان خۆش بە .

فەرمووی : (بەڵکو ئەو دەبێ لێتان خۆشبێت) .

: ئەم حەدیثە ئەوە دەگەیەنێت کە رسول الله ﷺ ناتوانێ لەباتی ئەو کەسە خۆش بێت لێت کە تۆ غەیبەتت کردووە، وە ئەویش هیچی پێناکرێ لەبۆت بەڵکو دەبێ ئەو لێت خۆش بێ .

**١٩٩** - جابر رضي الله عنه دەفەرمووێ : لەگەڵ رسول الله ﷺ بووین لە سەفەرێکدا، بۆنێکی پیس بڵاوبویەوە، رسول الله ﷺ فەرمووی : (کۆمەڵێك خەڵکی مونافیق غەیبەتی کۆمەڵێك موسڵمانیان کرد، لەبەر ئەو شتە ئەم بۆنە بڵاوبوویەوە) .

٤٠٠ - ابن شوذب دەفەرمووێ : (پیاوێک بە محمدی کوڕی سیرینی گووت : من غەیبەتی تۆم کردووە، گەردنم ئازاد بکە .

ئەویش فەرمووی : من ڕقم لەوەیە و حەزناکەم کە شتێك اللّٰه حەڕامی کردووە لەسەرت گەردنتی لێ ئازاد بکەم) .

٤٠١ - جابر رضي الله عنه دەفەرمووێ : لەگەڵ رسول اللّٰه ﷺ بووین لە سەفەرێکدا، بۆنێکی پیس بڵاوبویەوە، رسول اللّٰه ﷺ فەرمووی : (ئایا دەزانن ئەم بۆنە چیە؟؟ ئەوە بۆنی ئەوانەیە کە غەیبەتی ئیمانداران دەکەن) .

٤٠٢ - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر بێت و یەکێك لە ئێوە لە کەلاکێك بخوات تا تێر دەبێت، زۆر باشترە بۆی لەوەی کە گۆشتی برا موسڵمانەکەی بخوات).

٤٠٣ - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (گەر پیاوێک لە دوونیا غەیبەتی یەکێك بکات لە ڕۆژی قیامەت ئەو کەسەی بەمردوێتێ دەهێننە پێش و پێی دەڵێن : بیخۆ هەروەك چۆن کە زیندوو بوو گۆشتەکەیت دەخوارد، ئەویش دەیخوات هێڵنج دەدات و دەڕشێتەوە).

٤٠٤ - شفي کوڕی ماتع الأصبحي دەفەرمووێ : (چوار چین هەن کە خەڵکی ناو جەهەننەم ئازار دەدەن سەرەڕای ئەو ئازارانەیان، لە نێوان الحميم

و الجحيم دەسوڕێنەوە، هاوار دەکەن بە وەیل و داوای مردن دەکەن، ئەهلی ئاگریش دەڵێن : ئەیهاوار ئەوانە چین لەسەر ئەزیەتی خۆشمان بوونەتە ئەزیەت بۆمان، یەکێکیان لەنێو تابوتێکی داپۆشراوە بە ئاگر وداخراوە، ئەویتر ڕیخەڵۆکی خۆی بە دوو خۆی داوە و دەڕوا، ئەویتر کێم و خوێنی پیس لە دەمی دێتە دەر، ئەویتر گۆشتی خۆی دەخوات، بەوەی کە گۆشتی خۆی دەخوات دەگوترێ : باشە ئەم کەسەی دواوە ئەوە چی کردووە بۆتە هۆی ئەزیەت وئازاری ئێمەش لەسەر ئەو ئەزیەتەی خۆمان؟ فەرمووی : دەڵێن ئەوەی دواوە گۆشتی خەڵکی دەخوارد و نەمیمەی دەکرد).

٢٠٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەوکاتەی میعراج م پێکرا ڕۆیشتم بەلای کەسانێك نینۆکەکانیان مس ە و لە دەم و چاو و سینگی خۆیان دەدەن و دەیرنن، بە جبریلم فەرموو : ئەوانە کێن ئەی جبریل؟

فەرمووی : ئەوانە ئەو کەسانەن کە گۆشتی خەڵکی دەخۆن، وە دەم دەخەنە نامووسیان) .

٢٠٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێك شتێك بڵێت لەسەر ئیماندارێک وە ئەو کەسە ئەو شتەی تێدا نەبێت، ئەوا اللّٰه دەیخاتە زەبالەی پاشماوەی جەهەننەمیەکان، تا وەکو بەڵگە دێنێ بۆ قسەکەی - یان دەگەڕێتەوە قسەکەی - ) .

٢٠٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەی کۆمەڵەی موسڵمانان، غەیبەتی موسڵمانان مەکەن).

٢٠٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەی ئەوانەی بە زمان ئیمانتان هێناوە و کەچی نەچۆتە ناو دڵتان، غەیبەتی موسڵمانان مەکەن، وە دوای عەیب و عاریان مەکەون، لەبەرئەوەی هەر کەس دوای عەیبی برا موسڵمانەکەی بکەوێت، الله دوای عەیبی دەکەوێت، هەر کەسیش الله شوێن عەیبی بکەوێت ئەوا فەضع دەبێت، ئەگەر لەناو ماڵی خۆیشی بێت) .

٢١٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (کاتێك کە بەندە لە ڕۆژی قیامەت دا پەڕاوەکەی دەدرێتەوە دەست، کۆمەڵێك چاکە دەبینێت کە ئەنجامی نەداوە، دەڵێ ئەی پەروەردگاری من بەڕاستی من ئەو کارە چاکانەم نەکردووە، پێی دەگووترێ : ئەوە بەهۆی ئەوەی خەڵك غەیبەتی کردووی بۆت نوسراوە، وە بەندەی تر هەیە کاتێك پەڕاوەکەی پێدەدرێ دەڵێ ئەی پەروەدگار ئەی فڵانە کات فڵانە چاکەم نەکرد؟ پێی دەگوترێ : لەسەرت ڕەش بوویەوە و لاچوون بەهۆی غەیبەت کردنت بۆ خەڵکی).

٢١١ - عمرة ی کچی عبدالرحمن دەفەرمووێ : (لە لای عائیشە بووم رضي الله عنها ئافرەتێك چوویە دەر جلەکەی زۆر درێژ بوو لەدوای هەرمابوو، ئافرەتێکیش ووتی : ئەوە چیە بۆ وا درێژە ئەم جلەی .

عائیشە خاتوون رضي الله عنها فەرمووی : بەڕاستی غەیبەتیت کرد، هەڵسە برۆ با گەردنت ئازاد بکا) .

**: ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە نابێ بهێڵی لە مەجلیسەکەتدا مەعصیەت بکرێ بە تایبەت حەقی خەڵکی .**

٢١٢ - عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێ : (ئێوە غەیبەتی یەکتری مەکەن، من لە لای رسول الله بووم ﷺ، ئافرەتێك تێپەڕی، گووتم : ئەوە جلەکانی زۆر درێژە .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (تف بکەوە) .

(تفم کردەوە پارچە گۆشتێک هاتە دەر لە دەمم) .

٢١٣ - (عەمری کوڕی عاص رضي الله عنه بە لای ماینێك ی مردارەوەبو و ورگ گەورەبوودا ڕۆیشت، وەستا لەسەری، فەرمووی : واللەهی ئەگەر یەکێکتان لەمە بخوات تا ورگی پڕدەبێت، باشترە بۆی لەوەی غەیبەتی برایەکی بکات) .

٢١٤ - عائیشە خاتوون رضي الله عنها دەفەرمووێ : (لای رسول الله ﷺ بووم باسی یەکێکم کرد .

فەرمووی : (من حەز ناکەم باسی هیچ کەسێک بکەم ئەگەر ئەوە و ئەوەم هەبێ).

٢١٥ - عائیشە خاتوون رضي الله عنها دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ لە لای ئێمە بوو، حەفصە خاتوون هاتە لامان، کاتێ ڕۆیشت، گوتم حەفصە باڵای کورتە .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (گۆشتی خوشکە موسڵمانەکەتت خوارد) .

منیش گووتم ئەی رسول الله ﷺ شتێکم نەگووتوە ئیلا مەگەر ئەوەی تێیدا هەیە .

فەرمووی : (ئەگەر تێیدا نەبووایە ئەوا بووختان بوو لەسەرت).

٢١٦ - عائیشە خاتوون رضي الله عنها دەفەرمووێ : (ئافرەتێکی کورت بەلامدا تێپەڕی، منیش دانیشتبووم لای رسول الله ﷺ، بە پەنجەم ئیشارەتم کرد کە وەك ئەو پەنجە کورتە .

ئەویش فەرمووی : (بەڕاستی غەیبەتیت کرد) .

٢١٧ - عائیشە خاتوون رضي الله عنها دەفەرمووێ : (لای رسول الله ﷺ بووم باسی یەکێکم کرد .

فەرمووی : (من حەز ناکەم باسی هیچ کەسێک بکەم ئەگەر ئەوە و ئەوەم هەبێ) .

منیش گووتم ئەی رسول الله ﷺ صفیة 👍 واتا ئاوها کورتە .

فەرمووی : (تۆ کەلیمەیەکت فرێدا گەر فرێ بدرێتە ناو دەریا ئەوا تێکی دەدا).

٢١٨ - لای رسول الله ﷺ باسی غەیبەت کرا، ئەویش فەرمووی : (ئەوەیە کە باسی براکەت بکەی بەوەی پێی ناخۆشە، ئەگەر ئەوشتەی تێدا هەبوو ئەوە غەیبەتت کردووە، وە ئەگەر تێیدا نەبێت ئەوا بوختانە بوختانە).

٢١٩ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (دەزانن غەیبەت چیە؟؟)

گووتیان : الله و رسولەکەی دەزانن .

فەرمووی : (باس کردنی براکەت بەوەی پێی ناخۆشە) .

گووتیان : ئەی گەر ئەوشتەی باسمان کرد تێیدا هەبوو .

فەرمووی : (ئەگەر ئەو شتەی گوتتان تێیدا بێت ئەوا غەیبەتە گەر تێیدا نەبێت ئەوا بوختانە).

٢٢٠ - لای رسول الله ﷺ باسی غەیبەت کرا، ئەویش فەرمووی : (ئەوەیە کە باسی یەکێك بکەی لە ڕەوشتی بەوەی پێی ناخۆشە).

گوتیان : ئێمە وا گوومانمان دەبرد کە غەیبەتە ئەوەیە شتەکەی تێدا نەبێت .

فەرمووی : (ئەوە بوختانە) .

٢٢١ - إبن عباس دەفەرمووێ : (دوو کەس نوێژیان کرد لەگەڵ رسول اللّٰه، کاتێك لە نوێژەکە تەواو بوون، رسول اللّٰه ﷺ پێی فەرموون : (دەست نوێژەکەتان هەڵبگرنەوە) یان گووتی نوێژەکەتان (ڕۆژوەکەتان تەواوبکەن بەڵام لەباتی ڕۆژێکی تر بیگرنەوە) .

گووتیان : لەبەرچی ئەی رسول اللّٰه؟؟

فەرمووی : (لەبەر ئەوەی غەیبەتی فڵان وفڵانتان کرد) .

---

: ئەم حەدیثە ضعیفە بەڵام بۆتێگەیاندنە لە ترسناکی تاوانەکە .

٢٢٢ - حەسەنی الجمحي دەفەرمووێ : (پیاوێک بەلای ئێمەدا ڕۆیشت تۆزێك خوی ئافرەتانە بوو ، کۆمەڵێک گووتیان کە ئەوە "نێرە موکە"، ئێمەش گەیشتینە عطاء ی کوڕی رباح و پرسیارمان لێکرد .

فەرمووی : هەرکێ ئەوەی گوتوە با دەست نوێژ و نوێژ و ڕۆژوەکەی دووبارە بکاتەوە).

**٢٢٣** - عبدالله ی کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (ئەگەر قسەیەکت کرد لەسەر یەکێك کە ئەو شتەی تێدا نەبوو ئەوا درۆیە، ئەگەر تێیدا هەبوو ئەوە غەیبەتە).



# باب : (١٣)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی کەفارەتی غەیبەت



**٢٢٤** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (کەفارەتی غەیبەت ئەوەیە کە داوای لێخۆشبوون بکەی بۆ ئەو کەسەی غەیبەتت کردووە) .

**٢٢٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (کەفارەتی غەیبەت بریتیە لە ئەوەی کە داوای لێخۆشبوون بۆ ئەو کەسە بکەی کە غەیبەتت کردووە، بڵێ : اللهم لە ئێمە و ئەویش خۆش ببە).

---

**: سەبارەت بە کەفارەتی غەیبەت ئەم دوو حەدیثە ضعیفن بەڵام بە قسەی ئیمامی موجاهید وارد بووە .**

**کاتێک باس دەکرێ فڵانە کەس بیدعەی هەیە یاخوود فێڵێك و تاوانێکی هەیە بۆ مەبەستی ئاگادارکردنەوە ئەوە نابێتە غەیبەت و تاوان بەڵکو واجبیشە کە خەڵک ئاگاداربکرێتەوە کۆدەنگی سەلەف دەفەرموون : کە فاسق و مبتدع و کافرباسکردنیان**

غەیبەت نیە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک درووست نیە بۆ خۆ بەرز کردن باسی بکەی،والله أعلم بالصواب .



## باب : (١٤)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی نەمیمە کردن و کەڕاهیەتەکەی



٢٢٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەهەشت ئەوەی قتات بێت)

قتاتیش واتا : ئەو کەسەی قسە دەهێنێ و دەبات .

٢٢٩ - بە حذیفەی یەمان گووترا : (فڵان کەس قسە دەبات بۆ ئیمامی عثمان، حذیفە ش فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئەوەی قسە دەگوازێتەوە ئەوا قتاتە) .

٢٣٠ - أبي إدريس دەفەرمووێ : (هەرکەس شوێن ئەو قسانە بکەوێ کە خەڵکی دەیکەن بۆنی بەهەشت ناکا .

خالد کوڕی عبدالله فەرمووی : (واتا ئەو کەسەی نەمیمە دەکات) .

٢٣٢ - رسول الله ﷺ ڕۆیشت بە لای کەسانێک لە لایەکی کەعبە دانیشتبوون .

پێی فەرموون : (لە اللہ بترسن، وە سەیربکەن بزانن چی تێدا ئەنجام دەدەن، چونکە ئەوە پرسیاری لێدەکرێ لەسەرتان، لەسەر کردارەکانیشتان، هەواڵ لە بارەتانەوە دەدات، وە بیرتان بێت ئەوەی تێیدا نیشتەجێ دەبێ ئەوانەن کە خوێنی خەڵک ناخۆن، وە ڕیبا ناخۆن، وە قسە ناهێنن و نابەن).

**٢٣٣** - زیدی کوڕی ثابت دەفەرمووێ : (گوێم لە ئوسقوفێک بوو - ڕاهیبی نصاراکان - کە خەڵکی نجران بوو، بە ئیمامی عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه ی گوت : (ئەی ئەمیری باوەڕداران ئاگاداربە لە سێ کوژەرەکە .

ئیمامی عومەر فەرمووی : ویلك ئەوە چیە کە سێ بکوژە؟

ئەویش گووتی : کەسێك دێتە لای ئەمیرێك قسەیەك دەکات بەدرۆ، ئەمیریش ئەو کەسە دەکوژێ کە ئەمە قسەکەی لەسەری کردوە، ئەبەم شێوەیە ئەم کەسەی قسەکەی هێناوە بوە هۆی کوشتنی خۆی و هاوەڵەکەی و ئەمیریش).

**٢٣٤** - عمری کوڕی میمون دەفەرمووێ : (کاتێك موسا علیه السلام چوە لای اللہ ﷻ پیاوێکی بینی لە ژێر عەرش، ئیرەیی بە شوێنەکەی برد، داوای لە اللہ کرد کە ناوەکەی پێ بڵێ، اللہ ش ناوەکەی پێنەگووت .

پێی فەرموو: بەڵام کردارەکەیت پێ دەڵێم کە سێ خوڕەوشتی تێدابوو، ئەم کەسە حەسودی بە خەڵك نەدەبرد لەوەی کە اللە پێی بەخشیوە لە فەزڵی خۆی، وە ئەزیەتی دایک و باوکی نەدەدا، وە نمیمەی نەدەکرد).

**٢٣٥** - ابن عباس دەفەرمووێ: رسول اللە ﷺ بەلای هەندێك لە دینگە و دیوارەکانی مەدینەدا ڕۆیشت، گوێی لێبوو کە دوو کەس ئەشکەنجە دەدرێن، فەرمووی: (ئەوانە سزا دەدرێن لەسەر شتی ئاسان، دووجار وایگووت، بەڵام ئەوانە ئاسان نین، یەکێکیان خۆی لە میز پاك نەدەکردەوە - نەدەپاراست -، وە ئەوەی تریش نەمیمەی دەکرد).

**٢٣٦** - إبن عباس رضي اللە عنهما دەفەرمووێ: (لەگەڵ رسول اللە ﷺ بەلای کۆمەڵێك لە دیوارەکانی مەدینەدا ڕۆیشتین کە گەیشتینە لای باغەکانی ئەنصاریەکان لە مەدینە، گەشتینە سەر دوو گۆڕ، رسول اللە ش ﷺ فەرمووی: (پاك و بێگەردی بۆ اللە، پاك و بێگەردی بۆ اللە، خاوەنی ئەم دوو گۆڕە سزا دەدرێن لەسەر شتێك کە گەورە نیە، یەکێکیان قسەی دەهێنا و دەبرد - نەمیمەی دەکرد -، ئەمەی تریش خۆی پاك ڕانەدەگرت لە میز).

ئینجا دوو لق لە خورمای تەڕی هێنا و شکاندی، کردیە دوو بەش و هەر بەشێك و لای سەری گۆڕێکی دانا، ئینجا فەرمووی: (بەڵکو کەمێك لەسەریان ئاسان بکات سزاکەیان تا وشك دەبێتەوە).

٢٣٧ - سهلی كوڕی عطية دەفەرمووێ : (ئێمە لای بیلالی ئەبو بوردە بووین پیاوێک هات، گووتی : خەڵكی الطف زەكات نادەن، ئەمیش چاودێرێکی نارد لەگەڵ پۆلیسەكانی، ئینجا ئەوانیش قسەكەیان بەتاڵ كردەوە كە وانیە، بیلال سێ جار گوتی اللّٰهُ أَكْبَر، گوێم لە باوكم بووە لە باپیرمەوە فەرموویەتی، گوێم لێبوو رسول الله ﷺ فەرمووی : (دەم درێژی ناكاتە سەر خەڵكی ئیلا كوڕی زینا نەبێت، یاخوود شتێكی لەوەی توش بوو بێت) .

---

: مەبەست پێی ئەوەیە كەسێك كە زۆر زینای كردبێ و قاڵ بوبێتەوە لە شەرم و لە تاوان كردن ئەثەرەكانی تریش هەمان و اتا دەگەیەنن لە ئەثەری ٢٤١ ابن عباس زۆر جوان ڕوونی دەكاتەوە طبعا حدیثەكەش ضعیفە .

٢٣٨ - لە عمری كوڕی خطابەوە كە سلمان ی كوڕی الربيعة ی باهلی هات شكاتی كرد لە یەكێك لە كاربەدەستەكانی وڵات، ئیمامی عومەریش گۆچانەكەی هێنا و لێیدا - لە سلمانی الربيعة - تا تەنگە نەفەس بوو .

أبو عبيد قاسم ی كوڕی سلام فەرمووی : أنهج : واتا تەنگە نەفەس بوون و لەرزین ئەوەی كە توشی مرۆڤ دەبێت و دەبورێتەوە، ئێمە واینابینن كە ئیمامی عومەر لێیدا بێت بەر لەوەی بزانێ ڕاست دەكات یان ڕاست ناكات ئیلا بۆ ئەوەیە كە ئەدەبی دابدات، بۆ ئەوەی هەموو تاكێک فێرنەبێت نمیمە

بكات لای سوڵتان، یان ڕقی لەوە بووە کە شکایەت بکرێ لە ئەمیرەکان، هیچ تەفسیرێکی نیە جگە لەم دوو ڕێگایە).

**٢٣٩** - ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە دەفەرمووێ : کۆمەڵێک لە حەکیمەکان فەرموویانە : (ڕاستگۆیی هەموو مرۆڤێک جوان دەکات ئیلا ئەوەی قسە دێنێ و دەبا، هەتا ڕاستتر بڵێ زیاتر ناشرین دەبێت، تۆ چ گومانێك بە یەکێك دەبەی کە ڕاستگۆییەکەی ناشرینی دەکات؟)

**٢٤٠** - یحیي کوڕی أبی کثیر دەفەرموێ : (ئەو کەسەی زۆر نەمیمە دەکات کوڕی زینایە) .

**٢٤١** - لە إبن عباس ەوە رضي الله عنهما دەربارەی ئایەتی | عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ |، الزنیم : ئەوەیە کە بە کەسێکی شەڕ ناسرابێت، هەروەک چۆن مەڕی خراپ دەناسرێتەوە بەوەی ناوەستێ).

**٢٤٢** - ئیسحاقی کوڕی عبدالله دەفەرمووێ : (هەر کەس گرنگی بەوە نەدات کە چی دەڵێت، یان چی لە بارە دەگوترێ، ئەم کەسە شەیطانە یان کوڕی زینایە).

٢٤٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەس دەست بگرێت بۆ حەمد و ستایشی خەڵکی بە سەرپێچی کردنی الله تعالی ئەو ستایشەی خەڵکی دەگەڕێتەوە بە ذم بۆی).

٢٤٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێك خواردنێك بخوات بە برایەکی موسڵمانی ئەوا الله هەمان خواردنی دەداتێ لەناو ئاگر، هەر کەسێك شتێک بپۆشێ بە بۆنەی برایەکی موسڵمانی ئەوا الله هەمان پۆشاکی لەبەر دەکات لەناو ئاگردا، هەر کەسێك هەوڵ بدات بە بۆنەی برایەکی موسڵمانی خۆی دەربخات و خەڵك گوێی لێبگرێت ئەوا الله لە قیامەتدا دەری دەخات و نیشانی خەڵکی دەدات) .

---

: و اتا ئەوکەسەی کە بۆئەوەی خۆی بەرز بکات برایەکی بشکێنێ، یان بەهۆی شکاندن یان جاسوسی لەسەر موسڵمانێک خۆی دەوڵەمەند و تێر بکا.

٢٤٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێك خواردنێك بخوات بە برایەکی موسڵمانی ئەوا الله هەمان خواردنی دەداتێ لەناو ئاگری جەهەننەم، هەر کەسێك شتێک بپۆشێ بە بۆنەی برایەکی موسڵمانی ئەوا الله هەمان پۆشاکی لەبەر دەکات لەناو ئاگری جەهەننەم، هەر کەسێك هەوڵ بدات

به بۆنەی برایەكی موسڵمانی خۆی دەربخات و خەڵك گوێی لێبگرێت ئەوا اللە دەری دەخات و نیشانی خەڵكی دەدات لە ڕۆژی قیامەتدا).

٢٤٦ - لە ئەسماء ی كچی یزیدەوە رضي الله عنها كە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئایا هەواڵتان بدەمێ بە باشترینتان؟) .

گوتیان : بەڵێ .

فەرمووی : (ئەوانەی كاتێك دەیانبینی اللە ت بیردەكەوێتەوە، وە ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خراپترینتان؟) .

گوتیان : بەڵێ .

فەرمووی : (ئەوانەی قسە دەهێنن و دەبەن، نێوان خۆشەویستان تێك دەدەن، ئەوانەش كە دەست درێژی دەكەنە سەر خەڵك و یان عینادن).

٢٤٧ - رسول الله ﷺ فەرمویەتی : (باشترین بەندەكانی اللە لەم ئوممەتەدا ئەوانەن كە كاتێك دەیانبینی اللە ت بیردەكەوێتەوە،خراپترین بەندەكانی اللە لەم ئوممەتە ئەوانەن كە قسە دەهێنن و دەبەن، ئەوانەی نێوانی خۆشەویستان تێك دەدەن، ئەوانەش كە دەست درێژی دەكەنە سەر خەڵك بە متكبری).

**٢٤٨** - ئەبوو موسای ئەشعەری رضي الله عنه دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ لەعنەتی کردووە لەو کەسەی کە نێوانی باوك و کوڕ تێکدەدا، یان نێوانی برا لە براکەی).

**٢٤٩** - ضمرة ی کوڕی ربیعة دەفەرمووێ : فەرمویانە : (خۆشحاڵی إبلیس کاتێك کە نێوانی خۆشەویستان تێک دەدرێ، وەک خۆشحاڵی ئەم کاتەیەتی کە أدم علیه السلام دەرکرا لە بەهەشت).

**٢٥٠** - إبن عباس دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ بەلای دوو گۆڕ تێپەڕی و فەرمووی : (خاوەنی ئەم دوو گۆڕە سزا دەدرێن لەسەر شتێک کە گەورە نیە، یەکێکیان قسەی دەهێنا و دەبرد، ئەمەی تریش خۆی پاک ڕانەدەگرت لە میز) ئینجا دوو لق لە خورمای تەڕی هێنا و شکاندی، کردیە دوو بەش و هەر بەشێك و لای سەری گۆڕێکی دانا .

ئینجا فەرمووی : بەڵکو کەمێك لەسەریان ئاسان بکات سزاکەیان تا وشک دەبێتەوە).

**٢٥١** - رسول الله ﷺ دەفەرموێ : (خراپترینی بونەوەرەکان لە لای الله تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوەیە کە قیامەتی خۆی دەدۆڕێنێ بۆ دوونیای کەسێکی تر).



# باب : (١٥)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی نەدانی مافی دایک و باوك و بەگوێ نەکردنیان و قێزەونی ئەم ڕەوشتە



٢٥٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ناگات بە دیواری پیرۆز - بەهەشت - ئەو کەسەی ئالوودەی مەی بێت، ئەوەی ئەزیەتی دایک و باوکی بدات، ئەوەی شتێک ببەخشێ و منەت بکات).

٢٥٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (چوار چین ناچنە بەهەشت: ئەو کەسەی ئالودەی مەی بێت، ئەوەی ئەزیەتی دایک و باوکی بدات، وە کوڕی زینا، کەسی منەتکار).

---

: بێگومان وەك خەواریج نابێ لەم فەرمودانە تێبگەین بەڵکو کە لەم فەرموودە و ئەوانی تریش دەفەرموێ ناچێتە بەهەشت، ئەگەر کافر بێت ئەوا تا هەتایە ناچێتە بەهەشت، بەڵام گەر موسڵمان بێت ئەوا سەرەتا ناچێتە بەهەشت تا پاك دەبێتەوە لە تاوانەکانی ئینجا دەچێتە بەهەشت تێگەیشتی تەواو ئەبەم شێوەیەیە، لە بابی نمیمەش

**باسمان كرد كه كوڕی زینا - واتا یەكێك كه زۆرزینابكات تا وای لێبێت خەڵك بڵێ ئەها فلانە كەسی داوێن پیسە.**

**٢٥٥** - عبداللهی كوڕی عمری كوڕی عاص رضي الله عنهما دەفەرموێ :
(ناچێتە بەهەشت كەسی منەتكار، وە ئەوەی ئەزیەتی دایك وباوكی بدات، ئالودەی مەی، كوڕی زینا).

**٢٥٦** - عبداللهی كوڕی عمری كوڕی عاص رضي الله عنهما دەفەرموێ :
(ناچێتە بەهەشت كەسی منەتكار، وە ئەوەی ئەزیەتی دایك وباوكی بدات، ئالودەی مەی، كوڕی زینا).

**٢٥٧** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەهەشت ئالودەی مەی، وە نە ئەوەی ئەزیەتی دایك وباوكی بدات، وە نە منەتكاریش) .

ئینجا إبن عباس دەفەرمووێ : (خەڵكی ئەمە قوڕس بوو لە سەریان ترسان توشی تاوان بن، منیش ئەوەم بینیوە لە كتێبی الله دەربارەی ئەزیەت دانی دایك و باوك | فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ | [**مُحَمَّدٍ : ٢٢**]

وە سەبارەت بە منەتكار فەرمویەتی : | يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ | [**البَقَرَةِ : ٢٦٤**] .

وه فەرمویەتی : لەسەر مەی | يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ | [المَائـِدَةِ: ٩٠]

٢٥٨ - أبو بكرة رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ شانی دادابویەوە و فەرمووی : (ئایا ئاگادارتان بکەمەوە بە گەورەترینی تاوانە گەورەکان، سێ دانەن، هاوەڵ دانان بۆ الله ﷻ، ئەزیەت دانی دایک و باوک) .

ئینجا دانیشت و فەرمووی : (وە ئاگادار بن لەگەڵ قسەی درۆ) .

٢٥٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەموو تاوانێک گەر الله بیەوێ لێ خۆش دەبێ لە ڕۆژی قیامەتدا، جگە لە ئەزیەت دانی دایک و باوک، الله ﷻ بۆ ئەو کەسەی خراپ بووە لەگەڵ دایک و باوکی ئەوا تۆڵەکەی دەخاتە ژیانی پێش لە مردنی).

٢٦٠ - طیسلة ی کوڕی معاویە دەفەرمووێ : پرسیارم کرد لە إبن عمر رضي الله عنهما پێم بڵێ دەربارەی تاوانە گەورەکان، ئەویش فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (تاوانە گەورەکان : شیرک بڕیاردان بۆ الله، بوختان کردن بۆ ئافرەتانی داوێن پاک، کوشتنی نەفس بە ناحەق، پشت هەڵکردنەوە لە کاتی جەنگ، خواردنی ڕیبا، خواردنی ماڵی هەتیو، خراپ بون لەگەڵ دایک وباوک).

**٢٦١** - وراد دەفەرموێ: مغیرة ی کوڕی شعبة نامەی بۆ معاویەی کوڕی سوفیان نارد و وابزانم بە دەستەکانی خۆی بۆی نوسی من گوێم لە رسول اللّٰه ﷺ بوو فەرمووی: (اللّٰه ﷻ سێ شتی حەڕام کردوە، وە نەهی کردوە لە سێ شت، حەڕامی کردوە ئەزیەت دانی دایک و باوک، زیندەبەچاڵ کردنی کچان، نەدانی مافی خەڵکی، وە نەهی کردوە لە سێ شت: قەدەغەی کردوە لە فلان گوتی و وا ئەڵێن، بەفیڕۆدانی ماڵ، زۆر پرسیارکردن).

---

**: هەم مانای زۆرپرسیارکردن دەدا، وە هەم ئەوەشی کە زۆرسواڵ بکات و داوای پارە بکات، زیندە بەچاڵ کردنی کچ نەماوە ئەمڕۆ بەڵام بەڕەڵا کردنی هەیە کە ئەمە خراپترە لەبەرئەوەی قوڕەیش بۆیە زیندەبەچاڵی دەکرد تا داوێن پیس نەبێت بەڵام ئەمڕۆ خۆمان داوێن پیسیان دەکەن والعیاذ باللّٰه.**

**٢٦٢** - معاویەی کوڕی سوفیان رضي اللّٰه عنه نامەی بۆ مغیرة ی کوڕی شعبە نارد و فەرموی: حدیثێکم پێ بڵێ لە رسول اللّٰه ەوە ﷺ، ئەویش بۆی نوسیەوە گوێم لێبووە لە رسول اللّٰه ﷺ نەهی کردوە لە ووتی ووتی، وە بە فیڕۆدانی ماڵ، و زۆر پرسیارکردن، وە نەدانی مافی خەڵکی، ئەزیەت دانی دایك و باوک، زیندەبەچاڵ کردنی کچان).

**٢٦٣** - پرسیارکرا لە عبید کوڕی جریج دەربارەی خراپ بوون لەگەڵ دایک وباوک لەوەی الله دایبەزاندوە بۆسەر موسا علیه السلام، ئەویش فەرمووی : (ئەگەر باوک ئەمری بە منداڵەکەی کرد بە شتێك و ئەمیش بە گوێی نەکرد، ئەوا مافی پێشێل کردوە، وە گەر گەیشتە ئەوەی کە باوک لای الله شکاتی کرد لەبارەی ئەوەی ئەم لەسەر ئەم کوڕە توشی بوە، ئەوا هەموو حەقێکی ئەم باوکەی پێشێل کردوە).

**٢٦٤** - عبدالله ی کوڕی أبی أوف دەفەرموێ : پیاوێك کاتی سەرەمەرگی بوو، پێیان گووت بڵێ لا إله إلا الله، نەیتوانی وابڵێ، رسول الله ش ﷺ فەرمووی : (وا بڵێ) .

گوتی : لە دڵمدا هەست بە شتێک دەکەم بۆیە ناتوانم .

رسول الله ﷺ فەرمووی : بۆ ؟

گوتی : خراپ بوونم لەگەڵ دایک و باوکم وام لێدەکا .

فەرمووی : ئایا زیندووە؟

گوتی : بەڵێ .

فەرمووی : بانگی بکەن .

فەرمووی : ڕازی ببە لە کوڕەکەت .

گوتی اللهم شاهێدی دەدەم بە تۆ و بە رسول ەکەت من لێی ڕازیم .

ئینجا توانی شایەتومان بهێنێ) .

**٢٦٥** - پرسیارکرا لە رسول الله ﷺ دەربارەی هاوەڵانی الأعراف ئەویش فەرمووی: (ئەوانە کەسانێکن لە ڕێگای الله دا کوژراون، بەڵام لە سەرپێچی دایك وباوکیان بونە، ڕێگریان لێدەکرێ لە چوونە ناو بەهەشت بەهۆی سەرپێچی کردنی دایک و باوکیان، وە کوژرانیان لە پێناو الله ڕێگریان لێدەکا لەوەی بچنە ناو جەهەننەم).

**٢٦٦** - تبیع دەفەرموێ : (ئەگەر زوڵم زۆر بوو و بڵاوبویەوە، منداڵیش ڕقی لە چارەی دایک وباوکی بوو، زستانیش مرد و بەرەکەتی نەبوو، حوکمیش نادادپەروەر بوو، لێدان بوو بە شمشێر - و اتا کوشتن لەباتی لێدان - ،دەجال زۆر بەخێرایی دێ بۆ ناوتان).

**٢٦٨** - عروە ی کوڕی زوبەیر رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (باش نەبوە لەگەڵ دایک وباوکی ئەوەی بە توندی تیلەی چاو سەیریان بکا).

**٢٦٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (باش نەبوە لەگەڵ دایک وباوکی ئەوەی بە توندی تیلەی چاو سەیریان بکا).

**٢٧٠** - يزيدى كوڕى أبى حبيب دەفەرمووێ : (پێمان گەیشتوە کە ئەگەر پیاو بە دایك و باوکی گوت من لەگەڵتان باش بوومە، ئەوە یەکێکە لە هەڵەکانیەتی).

**٢٧٢** - عمرى كوڕى ميمون دەفەرمووێ : (کاتێك موسا علیه السلام چوە لای الله ﷻ پیاوێکی بینی لە ژێر عەرش، ئیرەیی بە شوێنەکەی برد، داوای لە الله کرد کە ناوەکەی پێ بڵێ، الله ش ناوەکەی پێنەگووت، پێی فەرموو : بەڵام کردارەکەیت پێ دەڵێم کە سێ خورەوشتی تێدابوو، ئەم کەسە حەسودی بە خەڵك نەدەبرد لەوەی کە الله پێی بەخشیوە لە فەزڵی خۆی، وە ئازاری دایک و باوکی نەدەدا، وە نمیمەی نەدەکرد) .

**٢٧٣** - لە حەسەنەوە لە ئەبو درداء رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئایا هەواڵتان پێ بدەم دەربارەی گەورەترین تاوانە گەورەکان، هاوەڵدانان بۆ الله، خراپ بون لەگەڵ دایک وباوك)، ئینجا دەستی برد بۆ لایەکی زمانی و فەرمووی : (ئاگاداربن لە قسەی درۆ)حەسەن ی بەصری ش وایکرد ئەبو درداء یش).

**٢٧٤** - عبدالرحمن رضي الله عنه دەفەرمووێ : پیاوێك هات بۆ لای رسول الله ﷺ گوتی ئامۆژگاریم بکە .

فەرمووی : (هاوەڵ بۆ الله بڕیار مەدە، ئەگەر سوتێنرای، وە ئەگەر سزاش درای) .

گوتی : زیاترم پێ بڵێ .

فەرمووی : (بە ئەنقەست واز لە نوێژ مەهێنە، پارێزەر و قەڵغانی الله و رسولەکەی ﷺ بەرین لە یەکێک بە ئەنقەست واز لە نوێژ بهێنێت) .

گوتی : زیاترم پێ بڵێ .

فەرمووی : (لەگەڵ دایك و باوکت خراپ مەبە تەنانەت جارێکیش، گەر ئەمریشیان پێ کردی کە هەموو ماڵەکەت دەربکەی ئەوا دەری بکە).

**٢٧٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک درۆ بکات بە ناوی رسول الله ەوە، یان درۆ بکا بە چاویەوە - و اتا خەون - ، یان درۆ بە دەمی دایک و باوکی بکا، ئەوا بۆنی بەهەشت ناکا).

**٢٧٦** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بۆنی بەهەشت بە نێوانی پێنج سەد ساڵ رێ دەڕوات، بەڵام بۆنی ناکات کەسی منەت کار، ئەووەی ئەزیەتی دایک وباوکی دەدا، وە کەسێک ئاڵودەی مەی بێت).

**٢٧٧** - فضيلی كوڕی عياض دەفەرمووێ: (لە سەرووی هەموو خراپێک خراپەیەك هەیە تا دەگات بە ئەزیەت دانی دایک وباوک، وە سەروی هەموو چاکەکان چاکەیەك هەیە تا خوێنی خۆت دەبەخشی لە پێناو الله ﷻ).

**: کۆتایی ئەم بابەش هات، وەك ڕونە لاتان کە باسی دایک وباوک باسێکی زۆرزۆر گرنگە لە دینی ئیسلامدا، لە فەرمودەکاندا جوان دیارە دوای شیرك هاتوە لە ئایەتەکانی قورئانیش هەمان شتە گرنگترین ئایەت ئەوەیە کە الله ﷻ دەفەرموێ: | وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا | (النِّسَاءِ: ٣٦).**

**دەبینین دەفەرموێ: الله بپەرستن و شەریکی بۆ بڕیار مەدەن یەکسەر باسی مافی دایک وباوک دەکات و دەفەرموێ لەگەڵیان باش بن ،تا کۆتایی ئایەتەکە...**

**وە بێگومان تەنانەت جیهاد کردنیش بەبێ ڕازی بوونی دایک و باوك نابێت بکرێت ئیمامی بوخاری بابێکی داناوە کە دەفەرمووێ: تێیدا بابی جیهاد ناکرێ ئیلا بە ئیزنی دایک وباوک نەبێت. تێیدا ئەم فەرمودەیە دەهێنێت، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ ﷺ أُجَاهِدُ.**

**قَالَ: (لَكَ أَبَوَانِ).**

**قَالَ: نَعَمْ.**

**قَالَ: (فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ).**



# باب : (١٦)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پچڕاندنی سیلەی ڕەحم کەڕاهەتی و قێزەونیەکەی



**٢٧٨** - عبدالرحمن ی کوڕی عوف رضي الله عنه چوە لای أبي الرداد الليثي، أبو الرداد الليثی ش پێی فەرموو باشترین حديث کامەیە بەلاتەوە کە لە رسول الله ـت بیستبێ ﷺ، عبدالرحمن فەرمووی : گوێم لێبوو رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله دەفەرموێ : من الرحمن م، وە ڕەحمم درووست کردوە، وە بەشێك لە ناوی خۆمم پێی داوە، ئەوەی بیگەیەنێت دەیگەیەنم بە ڕەحمی خۆم، ئەوەی بیپچڕێنێ دەیپچڕێنم لە ڕەحمی خۆم).

**٢٧٩** - عبدالله ی کوڕی قارظ چوە لای عبدالرحمن ی کوڕی عوف، عبدالرحمن پێی گوت ئایا سیلەی ڕەحمت گەیاندوە؟ من گوێم لێبووە لە رسول الله ﷺ دەیفەرموو : (الله دەفەرموێ : من الرحمن م، وە ڕەحمم درووست

کردوه، وه بەشێك لە ناوی خۆمم پێی داوه، ئەوەی بیگەیەنێت دەیگەیەنم بە ڕەحمی خۆم، ئەوەی بیپچڕێنێ دەیپچڕێنم لە ڕەحمی خۆم).

٢٨٠ - تا ٢٨٤ هەمان فەرموودەیە .

٢٨٥ - عبدالله ی کوڕی عمرو رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (لە ڕۆژی قیامەتدا رەحم دەکرێتە ناو جۆرێك لە خوری و وەك ئەوەی پێچراوە و سەری هەیە، دەست دەکات بە قسەکردن بە زمانێکی ڕێک و پاراو، ئەوە دەبڕێ لە رەحم کە رەحمی پچڕاندوە، ئەوەش دەگەیەنێ بە رەحم کە رەحمی گەیاندوە).

٢٨٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (خێراترین سزا کە بگات بە تاوانێك : دەست درێژی کردنە سەر خەڵك - هەموو شێوازەکانی -، پچڕاندنی سیلەی ڕەحم) .

٢٨٧ - میمونی کوڕی مهران دەفەرمووێ : عمری کوڕی عبدالعزیز پێی گوتم، ئەی میمون ئامۆژگاریت دەکەم بە سێ شت بیانپارێزە .

گوتم : ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەمانە چین؟

فەرمووی : (بەهیچ شێوەیەك بەتەنیا مەبە لەگەڵ ئافرەتێک بە بێ بونی مەحرەمێک لە نێوانتان ئەگەر بێت و قورئانیشی لەسەر بخوێنی، وە تێکەڵی

ئەوە مەبە کە سیلەی ڕەحمی پچڕاندوە، بەڕاستی اللّٰه ﷻ لە دوو ئایەت دا لەعنەتی لێکردوە ئایەتێک لە سورەتی الرعد کە دەفەرمووێ : | وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ | [الرَّعدِ : ٢٥]

وە لە سورەتی محمد | فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرْحَامَكُمْ * أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ | [مُحَمَّد : ٢٢ - ٢٣] .

**٢٨٨** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی ئالودەی مەی بێت، وە ئەوەشی باوەڕیکات بە سحر، وە ئەوکەسەی سیلەی ڕەحمی پچڕاندوە).

**٢٨٩** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی سیلەی ڕەحمی پچڕاندوە) .

**٢٩٠** - تا **٢٩٢** هەمان فەرموودەیە .

**٢٩٣** - عابس کوڕی عبس الغفاري لەسەرماڵەکەی بوو بینی خەڵک ڕادەکات لە پەتا، ئەویش فەرمووی : ئەی طاعون وەرە من ببە بۆ لای خۆت، کوڕە مامێکی لەوێ بوو گوتی : ئاواتی مردن دەخوازیت لەکاتێکدا گوێت لێبووە کە رسول اللّٰه ﷺ فەرموویەتی: (تەمەنای مردن مەکەن) .

ئەویش فەرمووی : من گوێم لێبووه لە رسول الله ﷺ دەیفەرموو : (دەستپێشخەری بکەن بە کرداری چاك پێش شەش شت : کاربەدەستانی نەزان و گێل، فرۆشتنی حوکم، زۆربوونی پۆلیس، هەرزان بونی خوێن، پچڕاندنی سیلەی ڕەحم، وە پەیدابوونی لەناکاوێك کە قورئان دەخوێنن، پێشیان ناخەن لەبەر ئەوەی زانا و تێگەیشتون، بەڵکو بۆ ئەوەیە گۆرانیان بۆ بڵێ)!!!!

**٢٩٤** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هیچ تاوانێک نیە کە الله بۆ خاوەنی تاوانەکە سزاکەی پێش بخا وەك لەم دەست درێژی کردن، وپچڕاندنی سیلەی ڕەحم).

**٢٩٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هیچ تاوانێک نیە کە الله بۆ خاوەنی تاوانەکە سزاکەی پێش بخا وەك پچڕاندنی سیلەی ڕەحم).

**٢٩٦** - أبو هريرة رضي الله عنه : کاتی ئێوارەی پێنج شەممە و شەوی هەینی هات، دانیشت و خەڵکیش لە دەوری کۆبونەوە و فەرمووی : با ئەزیەتمان نەدات هەر کەسێك سیلەی ڕەحمی پچڕاندوە با هەڵسێ لە مەجلیسەکەمان، ئینجا گەنجێك هەڵسا، چوە لای پوری کە دوو ساڵ بوو هەجری کردبوو و قەطعی کردبوو، سەلامی لێکرد، پوری گوتی ئەی کوڕی برام چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە، گەنجە گوتی هیچ، بەڵام من دانیشتبوم لە لای أبو

هريرة و فەرمووی، با ئەزیەتمان نەدات هەر کەسێك سیلەی ڕەحمی پچڕاندوە با هەڵسێ لە مەجلیسەکەمان هەروایگوت تا سێ جار، پوری پێی گوت بگەڕێوە بۆلای لێی بپرسە کە بۆچی وایگوتوە، ئەمیش گەڕایەوە و چیرۆکەکەی خۆی بۆ باس کرد و پوریشی چی گوتوە هەمووی گوت، ئینجا ئەبو هریرة فەرمووی : گوێم لێبوو رسول الله ﷺ فەرمووی : (کردارەکانی بەنی ئادەم هەموو ئێوارەیەکی پێنج شەممە لەسەر شەوی هەینی نیشان دەدرێنەوە، کرداری ئەو کەسە قەبوڵ نابێت کە سیلەی ڕەحمی پچڕاندوە) .

٢٩٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (اللّٰه دەفەرمووێ : من الرحمن م، وە ڕەحمم درووست کردوە، وە بەشێك لە ناوی خۆمم پێی داوە، ئەوەی بیگەیەنێت دەیگەیەنم بە ڕەحمی خۆم، ئەوەی بیپچڕێنێ دەیپچڕێنم لە ڕەحمی خۆم).

٢٩٨ - عبداللّٰە ی کوڕی عمرو رضي الله عنهما دەفەرمووێ کە کَردَم کوری سفیان الثقفي گوتی : ئەی رسول الله ﷺ من نەزرم لە خۆم گرتوە قوربانی بکەم لە وشترەکەم لە بوانە .

رسول الله ﷺ پێی فەرموو : (ئایا لەسەر بت دەیکەی؟)

گوتی : نا .

پێی فەرموو : (ئەی ئایا لەو شوێنە ئاهەنگ و کۆبونەوەی بت پەرستەکانە؟)

گوتی : نا .

ئەویش پێی فەرموو : (وەفا بە نەزرەکەت بکە هەر کات بوو، وە بزانە ئەی کردم کە نەزر کردن و سوێند خواردن نیە لە سەرپێچی کردنی اللّٰه، وە نە لە پچڕاندنی سیلەی ڕەحم) .

**٢٩٩** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (قەومێك شەوان دەمێننەوە لەم ئوممەتەی من لەسەر خواردن و خواردنەوە و شتی بەتاڵ، بەیانی دەکەنەوە مەسخ بونە و بون بە مەیمون و بەراز، وە توش دەبن بە ڕۆچون، مسخ، شت بارین بەسەریان لە ئاسمانەوە، هەتا وایلێدێ خەڵك بەیانی دەکاتەوە دەڵێن : ئەم شەو فلانە هۆز لەناو چون، وە فلانە ماڵ توشی لەناو چون بوون، وە لە ئاسمانەوە چۆن بروسکە دێت ئاوا بەردیان بەسەر دەبارێت بۆ سەر دانیشتوانی، وەك چۆن بەرد نێردرا بۆ سەر قەومی لوط، وە بۆ کۆمەڵگە و ماڵیان دێت وەك چۆن دابەزیە سەر قەومی لوط، وە بایەکی توندیان بۆ دەنێرێت وەك چۆن قەومی عاد ى بەهیلاك برد لەسەرئەو هۆزانەش لەناوی بوون، وە لەسەر ماڵەکانیشیان، بەهۆی ئەوەی مەی دەخۆنەوە، وە ڕیبا دەخۆن، وە ئافرەتی ڕاقیسەیان هێنا، وە حەریریان پۆشی، و قطعی سیلەی ڕەحمیان کرد) .

**٣٠٠** - گوێم لە عبداللە ی کوڕی زوبەیر بوو کاتێک بینای کەعبەی چاک کردەوە لەژێریەوە نوسراوێکی بینیەوە کە لە سێ دێڕ نوسراو پێکهاتبوو، بانگی پیاوێکی کرد کە بۆی بخوێنێتەوە، یەکەم دێڕ نوسرابوو، من اللە م پەروەردگاری مەککە م، درووستم کردوە ئەو کاتەی ڕۆژ و مانگ م درووست کردوە، وە دەورم داوە بە حەوت مەلائیکەتی حنیف - واتا موەحید و پاك - ، وە بەرەکەتم خستۆتە ناو ئاو و گۆشتەکەی، وە لە دێڕی دووەم نوسرابوو : من اللە م خاوەنی مەککە م ڕەحمم خلق کردوە بە دەستەکانم، وە بەشێک لەناوی خۆمم پێ بەخشیوە، هەر کەس بیگەیەنێت دەیگەیەنم بە ڕەحمی خۆم، هەر کەس بیپچڕێنێ دەیپچڕێنم، وە لە دێڕی سێیەم نوسرابوو : من اللە م خاوەنی مەککە خێرم درووست کردوە، وە شەڕیشم دروست کردوە) .

**٣٠١** - رسول اللە ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی سیلەی ڕەحمی پچڕاندوە) .

**٣٠٢** - أبي سبرة الهذلي دەڵێ کەوا زیاد ی إبن زیاد پرسیاری لێکرد دەربارەی حەوض - حوضي رسول اللە ﷺ - : گوتی من وای نابینم حەق بێت، وە پرسیاری کردوە لەسەر ئەم بابەتەش لەلایەن ابو برزة و عائذ بن عمرو و براء کوڕی عازیب، گوتی من بەڕاستی نازانم .

ئینجا ابو سبرة الهذلي گوتی : ئایا حەدیثێکت بۆ باس بکەم لەناو ئەم حدیثه شیفا هەبێت؟ باوکی تۆ منی نارد بە زەکاتەوە بۆ لای معاویە، گەیشتم بە عبداللّه ی کوڕی عمرو کوڕی عاص بە دەمی خۆی بۆی باسکردم و بە دەستەکانی خۆم نوسیم کە چی گوێ لێبووە لە رسول اللّه ﷺ، نە پیتێکی زیاد دەکەم نە کەم دەکەم، بۆی باسکردم کە گوێی لە رسول اللّه ﷺ بووە فەرمویەتی : (اللّه حەزی لە داوێن پیسی نیە، وە حەزی لە داوێن پیس نیە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە قیامەت نایەت تاکو زمان پیسی و داوێن پیسی پەیدا نەبێت، وە خۆ فێرکردنیش، وە پچڕاندنی سیلەی ڕەحم، وە دراوسێی خراپ، تا ئەمانەت پارێز بە خائین دادەنرێ، وە خائین بە ئەمین دادەنرێ، وە نمونەی بەندەی ئیمانداریش وەك هەنگ وایە پاك دەخوات، پاکیش دەدا، وە نمونەی بەندەی ئیماندار وەك پارچەیەك لە زێڕە فوی تێبکە، پاک دەبێتەوە، دەیکێشی هیچ کەم ناکات، وە مەوعیدمان لەسەر حوضە، درێژیەکەی وەك پانیەکەیەتی، دوریەکەی لەنێوان أیلة بۆ مەککەیە، وە ئەوەش ماوەی مانگێکە، تێیدایە شتانێك وەك ئەستێرەی درەوشاوە، ئاوەکەی زۆر سپیترە لە زیو، هەرکەس پێی بگات و لێی بخواتەوە دوای ئەوە هەرگیز ماندوو و تینو نابێت) .

ئینجا إبن زیاد گوتی : گوێم لێنەبوە لەسەر حەوض حەدیثێک کە بەم شێوە جێگیری بکات، شاهێدی دەدەم کە حەوض حەقە. وە پەڕاوەکەشی وەرگرت کە ئەم نامەیەی لێنوسرابوو..

**٣٠٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی لە نیشانەکانی قیامەت بریتیە لە داوێن پیسی و زمان پیسی، وە خۆ فێرکردنی، وە دراوسێی خراپ، پچڕاندنی سیلەی ڕەحم، وە ئەمانەت پارێز دەبێتە خائین، خائین دەبێتە ئەمانەت پارێز، نمونەی ئیماندار وەك پارچەیەکە لەزێڕ کە بیتوێنیەوە ئەوەندە پاکە بیکێشەوە وەزنی کەم ناکات، وە نمونەی ئیماندار وەك هەنگوین وایە ، پاك دەخوات، پاکیش فڕێ دەدا، ئاگاداربن باشترین شەهیدەکان ئەوانەن کە دادوەرن، باسترین کۆچکەرەکان ئەوانەن کە وازلەوەدێنن کە الله حەڕامی کردوە، ئاگاداربن باشترین موسڵمان ئەوەیە کە موسڵمانان سەلامەت بن لە دەست و زمانی، ئاگاداربن حەوضی من درێژیەکەی وەك پانیەکەیەتی، سپی ترە لە ماست، وە لە هەنگوین خۆشترە، قاپەکانی بە قەدەر ئەستێرەکانی ئاسمانە، لە زێڕ و زیوە، هەرکەس لێی بخواتەوە دوای ئەوە هەرگیز تینوو نابێت) .

**٣٠٤** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (کردارەکانی بەنی ئادەم نیشان دەدرێن لە هەموو ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە، الله لە تاوانەکان خۆش دەبێت، جگە لەوەی سیلەی ڕەحم ی پچڕاندوە، لەگەڵ ئەوەی دووکەس پەیوەندیان نەبێت) .



# باب : (١٧)

## ذەمی دوو ڕوویی و قێزەونیەکەی، وە پەنا گرتن بە الله لێی



٣٠٥ - رسول الله ﷺ دەپاڕایەوە و دەیفەرموو : (اللهم دڵم پاک بکەیتەوە لە نیفاق، وە داوێنم لە زینا، وە زمانیشم لە درۆ) .

٣٠٦ - مالکی کوڕی دینار دەفەرمووێ : (خوێندمەوە لە تەوڕات : ئەمانەت بەتاڵ بویەوە - دەبێت - ، وە پیاو لەگەڵ هاوەڵەکەیدا وەك دوو دیوی جیاواز وان، الله هەردوکیان بە هیلاک دەبات ئەوانەی وا جیاوازن) .

٣٠٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک دوو ڕووی هەبێت لە دوونیادا ئەوا دوو زمانی دەبێت لەناو ئاگر لە ڕۆژی قیامەتدا) .

٣٠٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەرگیز نابێت کەسی دووڕوو بکرێت بە ئەمین - هەرگیز جێگای ئەمن و پشت بەستن نیە - ) .

**٣١٠** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لە خراپترینی خەڵکی دوو ڕووەکانن، ئەوەی دێتە ئەملا بە ڕووێک، وە لەولاش بە ڕووێکی تر) .

**٣١٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەرگیز ئەوە نابێت بۆ کەسی دوو ڕوو کە لە ڕۆژی قیامەتدا یەك ڕووی هەبێت) .

**٣١٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەس دوو زمانی هەبێت لە دوونیادا ئەوا اللّٰه دوو زمانی ئاگری دەداتێ لە ڕۆژی قیامەت) .

**٣١٤** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێك دوو ڕووی هەبێت لە دوونیادا ئەوا اللّٰه دوو زمانی ئاگری بۆ درووست دەکات لە قیامەتدا).

**٣١٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بوغزاوترین مخلوق لە لای اللّٰه ﷻ لە ڕۆژی قیامەتدا بریتین لە: درۆزنەکان، خۆ بەگەورە زانەکان، ئەوانەی زۆر ڕق هەڵدەگرن لەناو دڵیاندا بەرامبەر براکانیان، کە پێشیان دەگەن پێچەوانەی ئەم ڕقە دەردەخەن، وە ئەوانەشی کاتێك بانگ دەکرێن بۆ لای اللّٰه و رسولەکەی خۆیان دوادەخەن - بێتاقەت دەبن - ، وە کاتێک بانگ دەکرێن بۆ لای شەیتان و کارەکانی شەیتان ئەوا زۆر خێران).

**٣١٦** - علی کوڕی قریش دەیفەرموو : (وەفا ڕۆیشت وەك ئەو کەسەی کە دوێنێ ڕۆیشتبێ، خەڵکیش لە نێوانی ساختەچێتی و فێڵ دان، کاتێك

لەیەکتر دیارن خۆشەویستی و ڕێز پیشانی یەکتر دەدەن، وە دڵەکانیان وەك کلکی دووپشکە).

٣١٧ - عبداللّه ی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : (با هیچ کەسێکتان نەبن بە إمعة) .

گوتیان : إمعة چیە؟

فەرمووی : (ئەوەی بە دوای هەموو بایەك دەکەوێت) .

٣١٨ - شەعبی دەفەرموێ : گوتم بە عبداللّهی کوڕی عمر رضي الله عنهما : ئێمە دەچینە لای سەرکردەکانمان مەدحیان دەکەین، کاتێک دێینە دەرەوە بە پێچەوانەی ئەو مەدحە قسەدەکەین، إبن عمر فەرمووی : (ئێمە لە سەردەمی رسول اللّه ﷺ ئەوەمان بە نیفاق دادەنا).

٣١٩ - رسول اللّه ﷺ دەفەرمووێ : (سێ شت هەیە لە هەر کەسێکدا هەبێت ئەوا مونافیقە، وە هەر کەسێك نیشانەیەکی تێدابێت، ئەوا نیشانەیەکی نیفاقی تێدایە، کە قسەی کرد درۆ دەکا، وە گەر بەڵێنی دا پێچەوانەی دەکات، کە ئەمانەتی پێدرا خیانەتی لێدەکا) .

٣٢٠ - عبداللّهی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرموێ : (چوار شت هەیە لە هەر کەسێکدا بێت ئەوا مونافیقە، ئەگەر هاتوو نیشانەیەکی تێدا

هەبوو ئەوا نیشانەیەکی نیفاقی تێدایە تا وازی لێدێنێ، کە قسەی کرد درۆ دەکا، وە ئەگەر بەڵێنی دا پێچەوانەی دەکات، کە ئەمانەت دار کرا غەدری لێدەکا، وە کە موناقەشە دەکا سنور دەبەزێنێ).

**٣٢١** - کعبي قورەظي دەفەرمووێ گوێم لە رسول الله ﷺ بوو فەرمویەتی : (نیشانەکانی مونافیق سێ دانەن: ئەگەر قسەی کرد درۆدەکا، ئەگەر بەڵێنی دا پێچەوانەی دەکات، کە ئەمانەتی پێدرا خیانەتی لێدەکا) .

وە بە ڕاست دانانی ئەمانەش لە کتابی الله هەیە، ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ﴾ .

وە دەفەرمووێ : ﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنۡ ءَاتَىٰنَا مِن فَضۡلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ [**التَّوبَة : ٧٥ تا ئایەتی ٧٧**]

ئینجا ئایەتی ﴿إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ [**الأحزاب : ٧٢**] .

**٣٢٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ نیشانە هەیە لە هەر کەسێکدا بێت ئەوا مونافقە، گەرچی بە ڕۆژوو بێت و نوێژ بکات و بڵێ موسڵمانم، ئەوەی کە ئەمانەتی پێدرا خیانەتی لێدەکا، وە گەر قسەی کرد درۆ دەکات، وە کە بەڵێنی دا پێچەوانەی دەکات) .

**٣٢٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ نیشانە هەیە لە مونافیق : گەر بەڵێنی دا پێچەوانەی دەكات، كە ئەمانەتی پێدرا خیانەتی لێدەكا، كە قسەی كرد درۆ دەكات) .

**٣٢٤** - پرسیاركرا لە حذیفەی یەمان رضي الله عنه دەربارەی مونافق، فەرمووی : (مونافق ئەوەیە كە قسە دەكات بەئیسلام، بەڵام كرداری پێناكات).

**٣٢٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (دەبینی خراپترینی خەڵكی لە لای الله لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەن كە دوو ڕوویان هەیە) .

**٣٢٦** - عبداللهی كوڕی عمروی كوڕی عاص رضي الله عنهما دەفەرموێ : (بەڕاستی ئەو كەسانەی توندترین سزایان پێدەگات لە ڕۆژی قیامەتدا بریتین لە ئەوانەی كافربوون لە هاوەڵانی المائدة، وە مونافقەكان، وە ال فرعون).

**٣٢٧** - حەسەنی بەصری دەفەرمووێ : (یەكێك لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ مرد كە دراوسێی حذیفة بوو رضي الله عنه، حذیفەی یەمانیش نوێژی لەسەر نەكرد، ئەمەش گەیشتەوە بە عمری كوڕی خطاب، بە حذیفەی گوت و ڕووی تێكرد : یەكێك لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ مردووە و نوێژی لەسەر ناكەی؟

حذیفە فەرمووی : ئەی ئەمیری باوەڕداران : ئەوە لەوانە - **مونافقەكان** -

ئیمامی عومەر فەرمووی : سوێندت دەدەم بە الله ئایا من لەوانم یان نا؟

فەرمووی : اللهم نا، وە ئەمانیش بە هیچ کەس نادەم لەدوای تۆ) .

**٣٢٨** - پیاوێک بە مسعری گوت : ئایا حەزدەکەی یەکێك بێت هەواڵت پێبدات لەسەر عەیبەکانت؟

فەرمووی : (ئەگەر بێت و دڵسۆزبێت بەڵێ، وە ئەگەر بێت و بیەوێت هێرش بکاتە سەرم نەخێر).

**٣٢٩** - المبرد دەفەرمووێ : (کاتێک ئێوە منتان لێ دیار نیە خیانەت بکەن لەمن، وە پەیمان و عەهدی نێوانمان بشکێنن، ئەو نهێنیە با عایدی خۆتان بێت، ئایا لەو کاتەدا کە لەلامن هەمان شتن کە لە لام نین) .

**٣٣٠** - ابن شهاب دەفەرمووێ : (کاتێ من قسەدەکەم بۆ خەڵك کە گوتم أما بعد وتەکانم دەوەستن و چاوەکانم کوێر دەبن کەچی بڵێم، ئەگەر بتەوێ بگەی بە خۆشەویستێك ئەوا دەبێت، بەڵام برایانی ئەهلی سیقە زۆر کەمن).



# باب : (١٨)

## چی هاتووە دەربارەی دەرکەوتنی نیفاق و بڵاوبونەوەی



**٣٣١** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر قسە دەرکەوت و کردار هەڵگیرا، وە زمانەکان نەرم بوون، دڵەکان تورە و ڕقدار بوون، وە سیلەی ڕەحم پچڕێندرا، ئەوکاتە الله لەعنەتیان لێدەکات و کەڕیان دەکات و چاویان کوێر دەبێت - **لەبەرامبەرحەق** - ) .

**٣٣٢** - حذيفة رضي الله عنه دەفەرمووێ : (نیفاقی ئەمڕۆ خراپترە لەو نیفاقەی لە سەردەمی رسول الله ﷺ هەبوو، لەبەرئەوەی ئەوان دەیانشاردەوە، بەڵام ئەمڕۆ ئاشکرای دەکەن) .

**٣٣٣** - پرسیارکرا لە حەسەنی بەصری ئایا نیفاق ماوە؟

فەرمووی : (گەر ئەوان نەبوونایە هەستان بە نامۆیی ئەکرد) .

**٣٣٤** - عبداللّهى كورِى سلمة دەفەرمووێ : پیاوێك لە لای حذیفە بوو گوتى اللهم مونافقەكان لەناو ببە، حذیفة پێی فەرموو : (ئەگەر وابوایە لەبەر چاوى دوژمن زۆر كەم دەبونەوە).

**٣٣٥** - أبو هريرة رضي الله عنه دەفەرموێ : (خەڵكى ڕۆیشتن، پاشماوەى خەڵك ماون) .

**٣٣٦** - مطرف كوڕى عبدالله فەرمووى : (موسڵمانان خەڵكن، وە پاشماوەى خەڵكیشیان تێدایە - منافق - ، موسڵمانان نوقم بوونە لەناو ئاوى النسناس- واتە منافق - ) .

**٣٣٧** - أبو عبدالله محمد بن جعفر دەفەرمووێ : (زۆر كەس هەیە دژایەتیەكەى شاردۆتەوە لەناو دڵیدا، وە چاوەكانى ئەوە نیشان دەدەن كە شاردویەتیەوە، ئەگەر منى بینى ماچم دەكات و دەڵێ مرحبا، وە لەناو چاوەكان و دڵیدا لێدان و هەموو شتێكى خراپ هەیە).

**٣٣٨** - أبو سهل دەفەرموێ : (ئەو كەسە برام نیە كە بە زمانى خۆشەویستى دەردەبڕێ، وە لەناو دڵیدا دژى ئەوە دەردەكەوێ كە گوتویەتى، ئەگەر تۆ ئەوەت زایە كردوە كە لە نێوانمان هەیە بەبێ بونى پێخزانیش، بەڵام لاى من هەموو شتەكان تۆماركراون).

: نيفاق چيه؟؟

نيشاندانی چاكه و شاردنه‌وه‌ی خراپه .

نيفاق چه‌ند جۆره؟

١ - نيفاقی بچوك/كه له دين ده‌رت ناكات وه‌ك ئه‌وكردارانه‌ی باس كراون له ئه‌ثه‌ره‌كان كه ئه‌ويش نيفاقی كرداريه.

٢ - نيفاقی گه‌وره/نيشاندانی ئيسلام و شاردنه‌وه‌ی كوفر/ئه‌مه له‌دين ده‌رت ده‌كات كه زياتر ئه‌مه له باطن دايه.

به‌ڕاستی ئه‌م بابه پێويسته زۆرلێ ورد ببينه‌وه هه‌رچه‌نده نوسه‌رئايه‌تی باس نه‌كردوه له‌به‌رئه‌وه‌ی گه‌ربوايه وئايه‌ت باسكرابوايه ئه‌وا زۆرزۆری ده‌خاياند، بۆيه ئێمه‌ی موسڵمان ده‌بێ بزانين نيفاق چه‌نده پيس و قێزه‌ون وخه‌ته‌ره ، مونافق له هه‌موو ڕوێكه‌وه ئيلا خراپه‌كه هه‌ڵده‌بژێرێ گه‌وره‌ترين نيشانه‌يان ڕاكردنه به‌ره‌و لای حوكمی الله كه الله ده‌فه‌رموێ :| أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّـٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓاْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَـٰلًۢا بَعِيدًا | (النِّسَاءِ : ٦٠) كه لێره‌دا ده‌بينين الله ﷻ حوكميان له‌سه‌ر ده‌دات به كافر و بێدين كه ده‌فه‌رموێ وا گومان ده‌به‌ن كه ئيماندارن،

وه بچوكترين شتيشی بێده‌نگ بوونه له‌سه‌رخراپه و تاوان وكوفرو شيرك وه‌ك ئه‌مڕۆ ده‌ڵێن كڵاوی خۆت بگره به‌ڵام دينی ئێمه ده‌ڵێ ئه‌مربه معروف بكه‌ن.

گه‌رئێمه‌ش له‌سه‌ريان بڕۆين تا دوو ڕۆژ باسه‌كه نابڕێته‌وه به‌ڵام زۆر به‌كورتی پێتان ده‌ڵێين كه تكايه ورد ببنه‌وه له قوڕئان به‌تايبه‌ت له‌م سوره‌تانه‌ی كه له مه‌دينه‌دا دابه‌زيون

نیشانەکانی مونافق بزانن و خۆتانی لێ بپارێزن وە خەڵکی پێ بناسنەوە گەر نەزانین نیفاق چیە تێی دەکەوین و ناشزانین، ئیمام حەسەنی بەصری دەربارەی نیفاق دەفەرموێ : (ما خافه إلا مؤمن، ولا أمِنه إلا منافق) .

واتا: لە نیفاق ناترسێت ئیلا ئیماندار نەبێت، وە لێی ئەمین نیە ئیلا مونافق نەبێت، بۆیە گەرسەیربکەین ئیمامی عومەرلێی ترساوە .

إبن أبي مليكة رحمه الله دەفەرمووێ :

(گەیشتوم بە ٧٠ لە هاوەڵان هەموویان لە نیفاق ترساون لە نەفسی خۆیان) .

بۆیە ئێمەش نابێ پاڵ بدەینەوە هەرئەوەندەی کە ناترسی شکت هەبێ لەوەی مونافق بیت، کە غەیبەتیش نیشانەیەکی گەورەی نیفاقە لێرەدا نەهاتوە باسکردنی .

گەرئێمە نەزانین مونافق کێیە ئەوا لەوانەیە توشمان بکات وگومڕامان بکات یاخود زەرەرمان لێبدات، بە چاکە کردن وشت نیە کە بزانین کابرا مونافقە یان نا ئەوەتا رسول الله ﷺ دەفەرموێ : (أكثرمنافقي أمتي قراؤها)

واتە : (زۆرترین مونافقی ئوممەتەکەم بریتین لە قورئان خوێنەکان) .

بۆیە لەوانەیە تۆببینی کە ئەوحەج دەکات وهەزاران چاکەی هەیە بەڵام عند الله الألد الخصيم .

نمونەی کەسی مونافق چۆنە؟؟

رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (مَثَلُ الْمُنَافِقِ كَمَثَلِ الشَّاةِ الْعَائِرَةِ بَيْنَ الْغَنَمَيْنِ تَعِيرُ إِلَى هَذِهِ مَرَّةً وَإِلَى هَذِهِ مَرَّةً) .

رواه مسلم

واتا: (نموونەی موونافق وەك مەڕێك وایە كە شەهوەتی جوڵابێ - بە با هاتبێ -جارێك دەچێتە نێوان ئەوڕانە مەڕە و جارێک بۆ لای ئەوڕانە مەڕە).

وە الله ﷻ دەفەرمووێ: | وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ | [البَقَرَةِ : ٨]

واتە: (لەناو خەڵـکیدا کۆمەڵێك هەن دەڵێن ئیمانمان بە الله و بە ڕۆژی دوایی هەیە بەڵام ئەوانە ئیماندارنین).

گەرتێ بڕوانین بۆمان باس دەکات کە ئەوان بە قسەی خۆیان ئیمانیان بە دوو ڕوکنی زۆر گەورەهەیە بەڵام الله شاهێدی دەدا کە ئیماندارنین.

| يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ | [البَقَرَةِ : ٩]

بەحسابی خۆیان الله و ئیمانداران دەخەڵەتێنن و پێیان ڕادەبوێرن بەڵام ئەوان فێڵ لەخۆیان دەکەن بەڵام چونکە بێ شعورن هەستی پێناکەن.

| فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ | [البَقَرَةِ : ١٠]

لەناو دڵیان نەخۆشی هەیە و بەدوای دەکەون بۆیە الله لێیان زیاد دەکات و سزایەکی زۆربەئێشیان بۆ هەیە بەوەی کە درۆ دەکەن...

بۆ زیاتربڕوانە ئایەتەکانی دواتر..

ئینجا ئەم موونافقانە تەنانەت سورەتیشیان لەسەردابەزیوە..

کاتێک هەرشتێک باس دەکەین ئەوان خۆیان لا مصلحە و ئیماندار بە گێل دەزانن و دەڵێن أنؤمن کما أمن السفهاء؟ ئایا وەك ئەوگێلانە ئیمان بێنین، ئەمڕۆش وا بەئێمە دەڵێن کە ئێمەش قسەیەکی حەق دەکەین وادەزانن لەگەڵ ئەوانمانە ویحسبون کل صیحة علیهم وادەزانن هەموو شتێك بۆ ئەوانە هێندە ترسنۆک و دڵ نەخۆشن.

زیاتر لەسەری نارۆین لەناو قورئان برو انه :

سورەتی البقرة، التوبة، المنافقون، باقی سورەته مەدەنیەکان .



# باب : (١٩)

# ناشرینی توڕەبوون و خۆڕزگار کردن لێی



**٣٣٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئاگاداربن توڕەبوون پشکۆیەك ئاگرە لەناو سینگی بەنی ئادەم، ئایا نەتبینیوە ئەو سورێتیەی نێو چاوی، وە دەرچونی دەمارەکانی، ئەگەر هەر یەك لە ئێوە شتێکی وای توش بوو ئەوا با لە زەویەوە نزیک بێت، ئاگاداربن باشترین پیاو ئەوەیە کە درەنگ توڕە دەبێ، وە خێرا پەشیمان دەبێتەوە، وە خراپترینی پیاوەکان ئەوانەن کە خێرا توڕەدەبن، وە درەنگ چاك دەبنەوە و دەگەڕێنەوە).

**٣٤٠** - أبو أمامه رضي الله عنه دەفەرمووێ : (بەڕاستی شەیتان دێت بۆ سەرجێگای پیاو ئەو کاتەی کە پیاوەکەی دەچێتە سەرجێگا لای خێزانەکەی و لایەتی، شەیتان عود و بەردی بۆ دێنێ - واتا خەیاڵی دەبات - ، یان شتێکی وا، بۆ ئەوەی لە خێزانەکەی توڕە بکات، ئەگەر هەر یەک لە ئێوە شتێکی وای توش بوو با توڕە نەبێت چونکە ئەوە لە کرداری شەیطانە).

**٣٤١** - جارية ی كوڕی قدامه رضي الله عنه دەفەرمووێ : پیاوێـك بە رسول الله ﷺ ی گوت : قسەیەكم پێ بڵێ كە پوخت بێت، بۆ ئەوەی لێی تێبگەم - **كاری پێ بكەم -** .

رسول الله ﷺ فەرمووی : ( **تورِه مەبە**) .

ئەویش چەند جارێك لێی دووبارە كردەوە - **و اتە وتی : ئامۆژگاریم بكە شتی تر بلێ -** .

رسول الله ﷺ هەموو جارەكان دەیفەرموو : (**تورِه مەبە**) .

**٣٤٢** - ئەبوو هورەیرە رضي اللهعنه دەفەرمووێ : پیاوێك هاتە لای رسول الله ﷺ و فەرموی : شتێكم فێربكە كە پێی بچمە بەهەشت .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (**تورِه مەبە**) .

**٣٤٣** - ئەبوو هورەیرە رضي اللهعنه دەفەرمووێ : پیاوێك هاتە لای رسول الله ﷺ و فەرمووی : هەواڵم پێ بدە بە كردارێك پێی بچمە بەهەشت، وە زۆر مەكە لەسەرم تاكو تێی بگەم و كاری پێ بكەم .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (**تورِه مەبە**).

**٣٤٤** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (**یەكتر فێربكەن، وە ئاسانكاری بكەن، وە شت قورِس مەكەن**) .

سێ جار وای فەرموو ئینجا فەرمووی : (ئەگەر توڕەبووی بێدەنگ بە، ئەگەر توڕەبووی بێدەنگ بە) .

٣٤٥ - لە یەکێک لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : پیاوێك گوتی : ئەی رسول الله ئامۆژگاریم بکە .

فەرمووی ﷺ : (توڕە مەبە) .

پیاوەکە گوتی : بیرم کردەوە کاتێك رسول الله ﷺ ئەوەی فەرموو، ئینجا تێگەیشتم کە توڕەبوون کۆکراوەی هەموو شەڕەکانە).

٣٤٦ - قاسم ابن أبي بزة دەربارەی ئەم ئایەتە | إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ | [الأعراف : ٢٠١]

فەرموی : (ئەوە توڕە بوونە) .

٣٤٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی شەیطان کلی چاوی، و لیکی دەمی، وهەناسەی ناخۆشی هەیە، لیکی دەمەکەی بریتیە لە درۆ، وە هەناسەکەی توڕەییە، وە کلی چاوی بریتیە لە خەو).

٣٤٨ - عروة ی کوڕی زوبەیر رضي الله عنه دەفەرمووێ : (نوسرابوو لە حیکمەتی داود - زەبور - : ئەی داود، ئامان ئاگاداربە لە توڕەبوونی توند، چونکە توڕەبونی توند لەناوبەری دڵی حەکیمە) .

**٣٤٩** - عمرانی كوڕی موسا دەفەرمووێ : هەندێك لە زانایان فەرمویانە : (هەروەك چۆن لاشەی مرۆڤ لەبەر چاوان گەورە دەبێ لە ڕۆژی تەماوی، بەم شێوەیە گوناح گەورە دەبێ لە كاتێكی توڕەییدا).

**٣٥٠** - سلیمان ی كوڕی صرد دەفەرمووێ : من دانیشتبووم لای رسول الله ﷺ، دوو كەس جنێویان بە یەكتر دەدا ، یەكێكیان دەم و چاوی سور هەڵگەڕا، جنێوی بە هاوڕێكەی خۆی دەدا، رسول الله ﷺ فەرمووی : (من وشەیەك دەزانم، ئەگەر بیڵێت ئەوا ئەوەی لەسەریەتی لادەچێ لەسەری، ئەگەر هاتوو پشتی بە الله بەست لە شەیتان) .

پێیان گوت : پەنا بگرە بە الله لە شەیطانی ڕەجیم و دەركراو، چونكە رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر كەسێك وابڵێ ئەوا لەسەری لادەچێ ئەوەی لەسەریەتی) .

**٣٥١** - رسول الله ﷺ دەفەرموێ : (هەركەس دەست لە توڕەبون هەڵبگرێ ئەوا الله ﷻ سزای لەسەر هەڵدەگرێ) .

**٣٥٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (پێنج شت لە سوننەتی پێغەمبەرانە : شەرم، نەرم و نیانی، سیواك، خۆ بۆن خۆشكردن) .

٣٥٣ - أم هانيء رضي الله عنها كچى أبو طالب دەفەرمووێ : ئەی رسول الله ﷺ دوعایەکم فێربکە دوعای پێ بکەم .

فەرمووی : بڵێ : (اللهم پەروەردگاری پێغەمبەر محمد، لە گوناهەکانم خۆش ببە، وە ئەو ڕقەی ناو دڵم لابدە، بمپارێزە لەو فیتنانەی گومڕاکەرن).

٣٥٤ - إبن عمر دەفەرمووێ : أبو محمد فەرمووی : دەڵێ علی کوڕی عاصم جارێك فەرمووی : (مرۆڤ هیچ گوشراوێکی نەخواردۆتەوە ئەجری ئەوەندە گەورەبێت لە خواردنەوەی توڕەبون، ڕق خواردنەوەیەك بێت لە پێناو الله).

٣٥٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەس ڕقی خۆی بخواتەوە، لە کاتێکدا دەتوانێ کە بیڕێژێ، الله لە ڕۆژی قیامەت لە ناو هەموو دروستکراوەکاندە بانگی دەکات بۆ ئەوەی بەدڵی خۆی هەڵبژێرێ لە هەر کام حۆری کە دەیەوێ) .

٣٥٦ - عبدالجليل الفلسطینی لە مامیەوە دەگێڕێتەوە کە گوێی لە رسول الله بووە ﷺ فەرمویەتی : (هەر کەسێک توڕەییەکەی بخواتەوە لە کاتێکدا کە دەتوانێ دەری ببڕێت، الله دڵی پڕ دەکات لە پارێزراوی و ئیمان، وە هەر کەسێک جلێکی جوان دابنێ لەبەر خۆ بەکەم زانین بەرامبەر الله

له کاتێکدا کە دەتوانێ بیکرێ - لەبەری بکات - ، ئەوا اللّٰه جلی ڕێزی لەبەردەکات) .

**٣٥٧** - إبراهیم کوڕی الجنید دەفەرمووێ : پیاوێك گەیشت بە یەکێک لە حەکیمەکان و قسەی پێگوت، حەکیمەکەش گرنگی پێنەدا و لێی توڕە نەبوو، بە حەکیمەکەیان گوت - قسەت پێ دەڵێت و توڕەنەبووی - ، ئەویش گوتی : ئەگەر بێت و ڕاست بکات ئەوا بۆچی توڕەبم لە ڕاستی؟ ئەگەر درۆش بکات بۆچی توڕەبم لەسەر شتێک کە وانیە).

**٣٥٨** - پیاوێك بە رسول اللّٰه ﷺی گوت : ئەی رسول اللّٰه چ شتێک توندترین توڕەبوونی هەیە؟

فەرمووی : (توڕەبونی اللّٰه) .

ئەویش گوتی : چ شتێک من دور دەخاتەوە لە توڕەبونی اللّٰه .

فەرمووی : (توڕە مەبە) .

**٣٥٩** - پرسیارکرا لە عبداللّٰهی کوڕی عباس رضي اللّٰه عنهما : ئایا کامیان زەرەری زیاترە بۆ جەستە توڕەبون یان خەم خواردن؟

فەرمووی : (هەڵقوڵاویان یەك سەرچاوەیە، بەڵام واتایان جیایە، هەر کەس بەربەرەکانێ لەگەڵ یەکێک هەبێت و دەرەقەتی نەیەت، بێدەنگ

دەبێت و ئەوەش دەبێتە خەم، وە هەرکەسێک بەربەرەکانێی لەگەڵ یەکێک هەبێت کە توانای لەسەری هەبێت ئەوا دەیکات بە تورەبون).

**٣٦٠** - أبا الحسن المدائني دەفەرمووێ : (پیاوێك گەیشت بە یەکێك لە حەکیمەکان، شاپێکی لە قاچەکانی حەکیمەکە دا لێدانێك کە ئازاری دا، هیچ نیشانەیەکی تورەبون لەدەم و چاوی حەکیمەکە بەدی نەکرا، پرسیاریان لێکرد لەسەئ ئەو تورەنەبوونە، فەرمووی : وام حساب کرد کە خۆم کێشا بە بەردێك، تورە بونم دروست نەبوو).

**٣٦١** - عبداللّٰهی کوڕی سلام رضي الله عنه دەفەرمووێ : ئیبلیس دەڵێت : من پشکۆیەکم لەناو دڵی بەنی ئادەم، ئەگەر ڕازی بوو ئەوا ئومێد و هیوای بۆ دێنم، وە ئەگەر تورەبوو ئەوا شیرینی دەچێژم).

**٣٦٢** - إبن عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : کە رسول الله ﷺ بە أشجی عبد القیس ی فەرموو : (دوو ڕەوشتت تێدایە کە الله خۆشی دەوێن : نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی) .

**٣٦٣** - حمید کوڕی عبدالرحمن دەفەرمووێ : پیاوێك بە رسول الله ﷺ ی فەرموو : هەندێك وشەم پێ بدە پێی بژیم، وە زۆر نەبێت کە لەبیری بکەم .

فەرمووی : (تورە مەبە) .

چەندجارێک وایگوت : هەموو جارەکان هەر ﷺ دەیفەرموو : (تورە مەبە).

٣٦٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر تورە بووی ئەوا دانیشە).

٣٦٥ - معاذی کوڕی جبل رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول اللّٰه ﷺ پێی فەرمووم : (ئامۆژگاریت دەکەم بە تەقوای الله، وە خۆ بە کەم زانین، و خواردنەوەی تورەبون) .

٣٦٦ - أبو وائل القاص دەفەرمووێ : ئێمە لای عروة کوڕی محمد کوڕی عطیه دانیشتبووین، پیاوێك جنێوی پێ دا تاکو تورەی بکات، هەڵسا لای ئێمە و هاتەوە دەست نوێژی هەڵگرتبوو، فەرمووی : باوکم بۆی گێڕامەوە ،لە باپیرمەوە عطیة کە ئەویش هاوەڵ بووە و دەڵێ کە رسول اللّٰه ﷺ فەرمویەتی : (تورەیی لە شەیتانەوەیە، وە شەیتان لە ئاگر دروست کراوە، ئاگریش بە ئاو دەکوژێتەوە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە تورەبو با دەست نوێژ هەڵبگرێ) .

٣٦٧ - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (من مرۆڤم تورە دەبم وەك چۆن مرۆڤەکان تورە دەبن، هەر پیاوێك جنێوم پێ داوە یان لەعنەتم لێ کردوە لە جگە لەوەی شایەن بووە، ئەوا بۆی دەبێت بە رەحمەت) .

**٣٦٨** - المغيرة كوڕی عبدالله الجعفي دەفەرمووێ : دانیشتبووین لای یەكێك لە هاوەڵانی رسول الله پێی دەگوترا خفصة یان ابن خصفة، سەیری كابرایەكی قەڵەو و بەتوانای كرد، پێم گوت بۆ سەیری دەكەی؟

فەرمووی : حدیثێكم بیر كەوتەوە لە رسول الله ﷺ ڕۆژێك لە ڕۆژان پێی فەرمووین : (ئایا دەزانن بەهێز كێیە؟)

وتمان : ئەوەی پیاوان دەبەزێنێ .

فەرمووی : (بەڕاستی ئازا و تەواوی ئازایەتی ئەو كەسەیە كە نەفسی خۆی دەگرێت لە كاتی تووڕەبون) .

**٣٧٠** - پیاوێك هاتە لای رسول الله ﷺ لەلای دەم وچاویەوە، گوتی : ئایا كام كردارە باشترینە؟

فەرمووی : (ڕەوشتی جوان) .

ئینجا لە دواوە هاتەوە و گوتی : ئایا باشترین كردار چیە؟،

سەری بۆلای بەرز كردەوە و فەرمووی : (ئایا تێنەگەیشتی؟ ئەوەیە كە تووڕەنەبی گەر دەتوانی).

---

: قَالَ رَسُولُ اللهُ ﷺ : « من كظمَ غيظًا، وهو قادِرٌ على أن يُنفِذَهُ، دعاهُ الله عَزَّوَجَلَّ على رؤوسِ الخلائقِ يومَ القيامةِ، حتى يُخيِّره مِنْ أيِّ الحُورِ شَاءَ » .

# باب : (٢٠)

# ئەوەی هاتووە لە ناشرینی بەخیلی، وە کەڕاهەتیەکەیشی



**٣٧٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئامان وریابن لە بەخیلی، لەبەر ئەوەی ئەوانەی پێش ئێوەی بە هیلاک برد، تا ئەوەی بردن کە خوێنی یەکتر بڕێژن، وە حەڕامەکانیان حەڵاڵ کرد).

**٣٧٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئامان وریابن لە بەخیلی، ئەوانەی پێش ئێوە دەستیان پێوە گرت، تا ئەوەی بردن کە خوێنی یەکتر بڕێژن، وە بانگی کردن بۆ ئەوەی کە حەڕامەکانیان حەڵاڵ کرد، وازیان لێنەهێنا تا ڕەحمی یەکتریان پچڕاند).

**٣٧٤** - محمد کوڕی المنكدر دەفەرمووێ : ئەوانەی پێش ئێمە دەیانفەرموو: (ئەگەر الله شەڕی بۆ قەومێک بوێت ئەوا خراپترینیان دەبێتە ئەمیریان، وە ڕزق و ڕۆزیان دەخاتە دەستی بەخیلەکانیان)

**٣٧٥** - پیاوێك له بەنی تمیم دەفەرمووێ : ئیمامی علی كوڕی أبو طالب وتاری بۆ داین و فەرمووی : (ئاگاداربن سەردەمێك بەسەر خەڵكی دادێت كە سەردەمی گاز گرتنە بە دوونیا، ئیماندار ئەوەی لەناو دەستیەتی قەپی لێدەگرێت و دەیگرێتەوە، وە لەكاتێكدا ئەمری بەوە پێنەكراوە، اللّٰه ﷻ دەفەرمووێ : ﴿وَلَا تَنسَوُاْ ٱلۡفَضۡلَ بَيۡنَكُمۡۚ﴾ (البَقَرَة : ٢٣٧) وا فەزڵ و تەبایی و برایەتی نێوان یەكتر لەبیر مەكەن .

**٣٧٦** - عبداللّٰهی كوڕی عەمری كوڕی عاص رضي الله عنهما فەرمووی: (ئایا كامیان توندترە بەخیلی یان الشح؟

خەڵكەكە ڕاجیاواز بوون عبداللّٰهی كوڕی عەمر فەرمووی : (الشح قورسترە لە بەخیلی، لەبەرئەوەی كەسی الشحیح بەخیلی لەوە دەكات كە لەنێو دەستی دایە و دەیگرێتەوە، وە بەخیلی لەوە دەكات كە لەناو دەستی خەڵك دایە تاكو بیبات، وە بەخیلیش ئەوەیە كە بەخیلی دەكات لەوەی كەلەناو دەستی دایە) .

**٣٧٧** - شەعبی دەفەرمووێ : (نازانم كامیان ڕۆچێنەرترن لە جەهەننەم دا بەخیلی یان درۆ كردن)

**٣٧٨** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەهەشت ئەوەی بەخیل بێت، وە کەسی فێڵباز و ساختەچی، وە خیانەتکاریش، وە ئەوەی خووی بە ناشرینی گرتوە) .

وە لە ڕیوایەتی أبو قلابة ش دەفەرمووێ :(کەسی خۆبەگەورەزان، وە بەخیل، وە خیانەتکار، وکەسی ڕەوشت ناشرین) .

**٣٧٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەهەشت کەسی فێڵباز، وە بەخیل، وە کەسی منەتکار، وە ئەو کەسەی خوی بە ڕەوشتی ناشرین گرتوە) .

**٣٨٠** - أبوزيد الأنصاري دەفەرمووێ : دەشتەکیەک وەستا لەلای أبي الأسود الدؤلي - ئەویش لە دوکانەکەی وەستابوو لەلای ماڵیان بوو، خورمای دەخوارد دەشتەکیەکە گوتی : الله چاکت بۆ بهێنێ، پیرێکی بێ توانام، ڕێبوارم و دەرۆم، وەفدێکی موحتاجم، زەمانە منی لەناو برد، فەقیری زەلیلی کردوم، بێ نیازی بکە ئەو کەسەی کە بێتاقەت و لاوازە .

أبو الأسود الدؤلي خورمایەکی هەڵگرت و پێی دا، دەشتەکیەکەش تێی گرت و بۆ دەم وچاوی هەڵدا و دواتر پێی گوت : الله هێندە بەشت بداتێ کە تۆ بەشی منت دا، وە وات لێبکا هانام بۆ بهێنی چۆن هانام بۆ تۆ هێنا، وە بەمن تاقیت بکاتەوە بەمن وەک چۆن منی بەتۆ تاقی کردەوە) .

**٣٨١** - عمرانی کوڕی موسا المؤدب دەفەرمووێ : (دوو وەفد هاتن بۆ لای أنشروان حەکیمێك لە هیند، وە فەیلەسوفێك لە ڕۆم، بە حەکیمە هیندیەکەی گووت قسەبکە .

گوتی : باشترینی خەڵکی ئەوەیە کە سەخی بێت و بەوە ناسرابێ، وە لە کاتی توڕەییدا بە ویقارڕ بێت، لە قسە کردنیشدا نەرم و نیان بێت، وە لە پلە بەرزیدا خۆ بەکەم زانە، وە بۆ هەموو کەسێك کە بە ڕەحم پێی دەگات ئەوا ڕەحمی پێ بکات .

وە ڕۆمیەکە هەڵسایەوە و گوتی : هەر کەسێك بەخیل بێت ئەوا دوژمن ماڵەکەی بە میرات دەگرێ، وە هەر کەسێك سوپاس و پێزانینی کەم بێت ئەوا ناگات بە براوەیی، وە کەسانی ئەهلی درۆ زەم کراون، ئەهلی نمیمەش بە فەقیری دەمرن، وە هەرکەسێک ڕەحم بە خەڵک نەکات ئەوا الله یەکێک زاڵ دەکات بەسەریدا کە ڕەحمی پێنەکات) .

**٣٨٢** - باوکی عباس محمد کوڕی یزید المبرد دەفەرمووێ : (کۆمەڵێک لە حەکیمەکان فەرموویانە : ئەو هەلانەی دێنە بەردەستت بیانقۆزەوە، وە هەموو کارێک بدە دەست کەسی شیاو، وە خەمێك لە ناو دڵت هەڵمەگرە کە هێشتا پێت نەگەیشتووە، وە بەڵێنی کاتێک مەدە کە وەفا کردن پێی لەدەست تۆدا نیە، وە بەخیلی بە ماڵێك مەکە لەسەر نەفسی خۆت، زۆر

کەسمان بینی کۆی کردبویەوە و بەڵام مێردی داهاتوی خێزانەکەی خواردی .

ئەو قسانەی کۆتایی لە محمد کوڕی یسیرەوە کە دەفەرمووێ : زۆر کەس ڕێگری لە نەفسی خۆی کرد لە لەزەتەکان لە ترسی فەقیری، بەڵام هیچ بەشێکی نیە لەو ماڵەی کۆی کردۆتەوە، گەرچی گرتنەوەکەی لەترسی ئەوەیە کە فەقیر نەبێت، ئەوە خۆی فەقیر کردووە پێش ئەوەی فەقیر بێت)

**٣٨٣** - العباس بن الفضل الربعي بە محمود الوراق ی فەرموو : تۆ لە ماڵەکەت سود وەرگرە پێش لە مردنت، وە ئیلا گەر مردیت ماڵەکەت لەگەڵت نیە، خۆت پێ نارەحەت دەکەی بە هەڵگرتنی کەچی لەدوات جێ دەمێنێ، بۆ غەیری خۆت و کەسێک کە ڕقی لێتە یان کەیفی پێت نایە، دێنە سەرت بە گریانی درۆوە، وە دڵخۆشن بەوەی بۆت کۆکردونەوە، هەموو ئەوەی لەوەی لە ناو دەستەکانت دابوو پێت دان، ئەویش جێت دەهێڵێ لەگەڵ خۆت و کردارەکانت) .

**٣٨٤** - هشام کوڕی عبدالملك سەیری کوڕەکانی دەکرد کەدەگرین لەکاتێکدا لەسەرە مەرگ بوو و پێی گوتن : هشام ماندوو بوو بە دوونیاوە بۆ ئێوە، ئێوەش تەنیا بۆی دەگرین لەسەری - واتا بۆ باوکیان - ، ئەوەی کۆم کردبوویەوە بۆتانم جێهێشت، وە ئێوەش کردارەکانی خۆم بۆ جێ دەهێڵن،

ئای چەندە قورس دەبێت ئەوەی هیشام بۆی دەڕوات گەر الله ﷻ لێی خۆش نەبێت).

**٣٨٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (پیسترین شت لە پیاودا بەخیلییێکە کە وات لێبکا زۆر هەوڵ بدەی، وە ترسنۆکیەك کە زۆر توند بێت هەموو شتێکت پێ بکات).

**٣٨٦** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ شت لەناو بەرن : بەخیلیەک کە گوێڕایەڵی بکەی، وە ئارەزوویەك کە شوێنی بکەویت، وە سەرسام بوونی پیاو بەخۆی) .

**٣٨٧** - لە الضحاك ەوە دەربارەی کەلامی الله | إِنَّا جَعَلْنَا فِيٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِيَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ | [**يسٓ** : ٨]

دەفەرمووێ : واتا بەخیلی، الله دەستی گرتوون لەوەی کە بیبەخشێت لە ڕێگای الله، ئەوانیش ڕێگای هیدایەت نابینن).

**٣٨٨** - عبدالكريم أبو أمية گوێی لەپیاوێک بوو دەیگووت : (بەخیلی عوزردارترە لە زاڵم .

عبدالكريم توڕەبوو وگووتی : الله سوێندی خواردوە کە بەخیل تێیدا نیشتەجێ نەبێت - **مەبەستی بەهەشتە** - ) .

**٣٩١** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (نەزر هیچ شتێک لە قەدەر ناگۆڕێت، بەڵکو بۆ لادانی بەخیلیە).

**٣٩٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی کەسی بەخیل دوورە لە الله عَزَّ وَجَلَّ، دوورە لە خەڵکی، دوورە لە بەهەشت، نزیکە لە ئاگر، وە نەزانێکی سەخی خۆشەویستترە لە لای الله عَزَّ وَجَلَّ لە بەخیلێکی الله پەرست، وە کوشندەترین دەرد بریتیە لە بەخیلی).

**٣٩٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (الله عَزَّ وَجَلَّ لە سێ کەس تورەیە : پیرێکی زیناکار، وە بەخیلێکی منەتکار، فەقیرێکی خۆ بە گەورە زان).

**٣٩٤** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (نموونەی ئەو کەسەی کە دەبەخشێت لەبەر الله وەك دوو کەس وان کە دوو پارێزەری ئاسنیان لەبەر بێت، لە نوکی پێیانەوە تا ملیان دادەپۆشێ، ئەوەی کە شت دەبەخشێت لە پێناو الله ئەوا جوڵەی ئاسانتر دەبێت و فراوانتر دەبێت جلەکەی، تا پەنجەکانی دەشارێتەوە هیچ دیارنابێت هێندە بەرین دەبێ، بەڵام ئەوەی بەخیلە نایەوێ هیچ شتێك ببەخشێت ئەوا توندتر دەبێت لەسەری، دەیەوێت بەرینی بکات و بڕێک بجوڵێ بەڵام هەر تەسک تر دەبێت و ئەویش پانتر دەبێت).

**٣٩٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (دوو ڕەوشت هەیە لە مرۆڤی ئیماندار کۆنابێتەوە : ڕەوشتی ناشرین و بەخیلی).

**٣٩٦** - أبا العباس محمد بن يزيد المبرد شعری دەگووت لەسەر قێزەونی بەخیلی و دەیفەرموو : (ئەی ئەهلی خاقان ئەگەر ئێوە نیعمەتتان بەسەربڕژێ و شوکری الله بکەن لەسەری تا لێتان نەبڕێت، بەڵام ئێوە جلی ئەو دەپۆشن - ڕزقی ئەو- ، ئەی ئێوە چیتانە بۆچی یادی الله ناکەنەوە بە سوپاس کردنی).

**٣٩٧** - بە میمونی کوڕی مهرانیان گووت : فڵان کەس هەموو کۆیلەکانی خۆی ئازاد کرد بەیەکەوە .

ئەویش فەرمووی : دووجار سەرپێچی اللهیان کردووە، بەخیلی تێدا دەکەن تا ئەوکاتەی لەبەر دەستەکانیەتی هەتا بۆ غەیری خۆیان زیادەڕۆیی تێدا دەکەن).

---

**واتا : زیادەڕۆییە جارێک هەمووی پێکەوە کە ئیشیان پێ نەمان، گرتنەوەیان لە کاتێک ئیشی پێیانە .**

**٣٩٨** - رسول الله ﷺ بە بەنی ساعیدەی فەرموو : (کێ گەورەی ئێوەیە) .

گوتیان : جدی کوڕی قیس .

فەرمووی : (بەچی شتێک کردۆتانە گەورەی خۆتان؟)

گوتیان : لەبەرئەوەی زۆرترین پارە وسامانی هەیە، وە ئێمە وادەزانین کە بۆیە دەوڵەمەند بووە چونکە بەخیلە .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (چ دەردێک هەیە کوشندەتر بێت لە بەخیلی).

گوتیان : کێ گەورەمانە؟ - کێ بکەین بە گەورەمان - .

فەرمووی : (بشر کوڕی البراء کوڕی معرور).

**٣٩٩** - موصعەبی کوڕی سعد دەفەرمووێ : سعد رضي الله عنه فێری ئەو دوعایەی دەکردین و بەبیری دەهێنایەنەوە لە رسول الله ـەوە ﷺ کە فەرموویەتی : (اللهم پەنا بەتۆ دەگرم لە بەخیلی، وە پەنا بەتۆ دەگرم لە ترسنۆکی، وە پەنا بەتۆ دەگرم لەوەی کە بگەمە تەمەنێکی زۆر گەورە کە شتم بیربچێ) .

**٤٠١** - إبن الأحمس دەفەرمووێ : (گەیشتم بە ئەبوو ذر و پێم گووت : ئەی ئەبوو ذر حەدیثێکم پێ گەیشتووە کە گێڕاوتەوە، ئەویش فەرمووی : کام حدیثەیە من لە یادم نیە، درۆم نەکردووە بە دەمی رسول الله"وە ﷺ، گوتم پێم گەیشتووە کە تۆ دەڵێی : سێ کەس الله رقی لێیانە .

فەرمووی : بەڵێ گوتومە و بیستوومە .

گوتم : کێن ئەوانەی الله ﷻ ڕقی لێیانە؟

فەرمووی : (بازرگانێک یان فرۆشیارێکی سوێند خۆر، وە فەقیرێکی خۆ بەگەورەزان، وە بەخیلێکی منەتکار) .

٤٠٢ - جبیری کوڕی مطعم رضي الله عنه لەگەڵ رسول الله ﷺ بوو کاتێک لە جەنگی حونەین گەڕایەوە، دەشتەکیەکان پێی گەیشتوون و داوای شتیان لێی دەکرد، هاتن زۆریان بۆهێنا و ڕێگاکەیان لێی تەسك کرد و رسول الله ﷺ چی پێی بوو پێی دان تەنانەت جلی سەرەوەیشیان برد، ئەویش لەسەر وشترەکەی بوو و فەرمووی : (جلەکەم بۆ بگێڕنەوە، ئەگەر بێتوو الله فەیئم پێ ببەخشێ بە قەدەر گەڵای ئەو دارانە ئەوا هەمووی بەش دەکەم لە نێوانتان، وە نامبینن بەخیل بم، وە نایبینن ترسنۆك بم، وە نابینن درۆ بکەم) .

٤٠٣ - کعبی ئەحبار دەفەرمووێ : (هیچ بەیانیەک نیە ئیلا دوو فریشتە ڕاسپێردراون و بانگ دەکەن : اللهم ئەوەی نابەخشێت بە هیلاکی ببە) .

٤٠٤ - عبدالله ی کوڕی خارجەی کوڕی زیدی کوڕی ثابت دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ یان بانگ کرد بۆ پیاوێك کە لە بەنی سلمة بوو وەفاتی کردبوو، کاتێك هات وپرسیاری لێیان کرد، باسیان کرد بەخێر و ستایشیان کرد کە باش بووە لەگەڵ دراوسێکانیشی بەڵام کەسێکی بەخیل بووە .

فەرمووی : (ئەی بەنی بەنی سلمة چ دەردێک هەیە کوشندەتر بێت لە بەخیلی، ئێوە نوێژ لەسەر هاوڕێکەتان بکەن) .

٤٠٥ - وهب کوڕی منبه دەفەرمووێ : (عابیدێک لە عابیدەکانی بەنی ئیسراِئیل هەر خەریکی اللّٰه پەرستی بوو بەهەموو تەمەنی لە کوخەکەیدا، زۆر خۆگر و دوونیا نەویست بوو، هەتا شەیاطینەکان شکاتیان کرد لەلای ئیبلیس، گوتیان : فلاّن کەس ماندووی کردووین، هیچ سودێکی لێنابینن .

گوتی : شەیتان خۆی چوو ئیشەکە بکات و لە دەرگای دا .

ئەویش گوتی : کێیە ئەوە .

گوتی : من ڕێبوارێکم دەرگام لێبکەوە تا شەو لە ماڵەکەتدا بمێنمەوە .

عابیدەکە پێی گووت : ئەوەتا گوند زۆر لێت دوورنیە بڕۆ بۆ لای ئەوان و لای یەکێکیان بمێنەوە .

إبلیس گوتی : لە اللّٰه بترسە، دەرگام لێبکەوە، من لە چەتە و دزەکان دەترسم، وە لە دڕندەکان دەترسم .

گوتی : ئەوە من نیم کە دەرگات بۆ بکەمەوە - و اتا حەقم نیە - .

ئیبلیس بێدەنگ بوو، ئینجا دووبارە لە دەرگای دا و گووتی : دەرگام بۆ بکەوە .

گوتی : ئەوە کێیە؟

إبليس گوتی : من مەسیحم - پێغەمبەر عیسا - .

ئەویش گوتی : ئەگەر تۆ عیسا بیت ئەوا هیچ ئیشم بە تۆ نیە و نامە و پەیامەکانی پەروەرگارت گەیاندووە، مەوعیدی تۆ قیامەتە .

ئیبلیس بێدەنگ بوو، دیسان لە دەرگای دا و گوتی بیکەوە .

گوتی : تۆ کێی؟

گوتی : من إبليس م .

فەرمووی : من ئەو کەسە نیم دەرگات بۆ بکەمەوە، ئەویش سوێندی خوارد و وای پێگووت کە هیچت لەگەڵ ناکەم کە زەرەرت پێ بگەیەنێت، بکەوە.

فەرمووی : ئینجا دابەزی، دەرگاکەی بۆ کردەوە، ئیبلیس سەرکەوت و لەبەر دەمی دانیشت .

ئیبلیس گوتی: چیم لێ دەپرسی بپرسە با پێت بڵێم، گوتی هیچ پێویستیم بەتۆ نیە .

ئینجا ئیبلیس هەستا و پشتی کردەوە. کابراش بانگی کرد ئەویش هاتەوە پێش، گوتی : دەی پرسیارێکت لێدەکەم .

گوتی : بپرسە .

گوتی : چ شتێک یارمەتی ئێوە دەدات کە نەوەی ئادەمی پێ بە هیلاک بەرن؟

گوتی : سەرخۆشی، ئەگەر بەنی ئادەم سەرخۆش بوو ئەوا هیچ شتێک ڕێگریمان لێناکات لەوەی بمانەوێ، ئینجا یاری پێدەکەین وەک چۆن منداڵ یاری بە تۆپ دەکات .

گوتی : چیتر؟

گوتی : تورەیی توند، ئەگەر بەنی ئادەم بگاتە ئەوپەڕ پلەی عیبادەت کە بتوانێ مردوو زیندوو بکاتەوە بە ئیزنی اللە، بێ ئومێد نابین لەوەی سوود وەربگرین لە کەمێك لە تورەییەکەی.

گوتی : چیتر؟

گوتی : بەخیلی، دێن بۆ لای بەنی ئادەم، ئەو نیعمەتانەی اللە کە پێی داوە وا بە کەمی نیشانی دەدەین، وە ئەوەی لەناو دەستی خەڵک هەیە بۆی گەورە دەکەین، هەتا بەخیل دەبێت لە حەقی اللە لەو ماڵەی هەیەتی و بەهیلاک دەچێت.



## باب : (٢١)

# ئەوەی هاتووە دەربارەی دراوسێی خراپ و کەڕاهەتیەکەی و زەم کردنی



٤٠٦ - ئەبو هريرة رضي الله عنه دەفەرمووێ : گوتیان ئەی رسول الله ﷺ، فڵانە ئافرەت بەڕۆژ بە ڕۆژوو دەبێت، وە شەو نوێژ دەکات، وە ئەزیەتی دراوسێکەی دەدات؟

فەرمووی : (ئەو لە ئاگردایە) .

گوتیان : فڵانە ئافرەت نوێژە فەڕزەکان دەکات، وە هەندێك جار کولێرە دەبەخشێ، وە ئەزیەتی دراوسێکانی نادات .

فەرمووی : (ئەوە لە بەهەشت دایە) .

٤٠٧ - جابر رضي الله عنه دەفەرمووێ : کە نوعمانی کوڕی قوقل هاتە لای رسول الله ﷺ، گوتی : ئەی رسول الله ئەگەر نوێژە فەڕزەکان بکەم، وە

حەڵاڵەکانی الله بە حەڵاڵ بزانم، و حەڕامەکانی الله بە حەڕام بزانم، وە هیچی دی زیاد نەکەم ئایا دەچمە بەهەشت .

فەرمووی : (بەڵێ) .

**٤٠٨** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە بەندە تەسلیمی الله نابێت تا دڵی سەلیم نەبێ، وە ئیمانی نیە تاوەکو دراوسێکەی پارێزراو نەبێت لە شەڕی) .

گوتیان : شەڕی بۆی چیە؟

فەرمووی : (زوڵم و زۆرداری کردن).

**٤٠٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی دراوسێکەی پارێزراو نەبێت لەشەڕی) .

**٤١٠** - أبو سهل ڕازی دەفەرمووێ : (ئاگادارتان دەکەمەوە بە تەقوای الله لە پەنهانی و ئاشکرایی دا، وە بەرگی ڕاستگۆیی مەگۆڕنەوە بە غەدر کردن، ببنە قەڵغان و پارێزەر بۆ دراوسێکەتان، ئەگەر ڕۆژگار وایکرد پێویستی بەتۆ بێت) .

**٤١١** - لە عبدالله ی کوڕی عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (حیکمەت وەربگرە لەوەی کە گوێی لێدەگریت، گەرچی ئەو پیاوە حیکمەتێکی دەربڕی

و خۆیشی ئەهلی ئەوە نەبوو، وەك ئەوەی لێدێت كە تیرێك بهاوێت بە بێ نیەتی پێكان بەڵام بیپێكێ).

٤١٢ - أم سلمة رضي الله عنها دەفەرمووێ : من لەگەڵ رسول الله ﷺ بووم لەژێر جێگا، مەڕێكی دراوسێكەمان هاتە ژورەوە، پارچە كولێرەیەكی برد كە لەژێر پەڕۆیەك دامنابوو، منیش ڕامكرد بۆ لای، وە لە نێوان ددانەكانی دەرمهێنا .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەوە كەمتر نیە لە ئەزیەتدانی دراوسێ).

٤١٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لە نیشانەكانی قیامەت بریتیە لە دراوسێی خراپ).

٤١٥ - عبدالله ی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : گوتم ئەی رسول الله ﷺ یان یەكێكی تر بوو وایگوت، ئایا گەورەترین تاوان چیە لەلای الله؟

فەرمووی : (هاوتا بۆ الله بڕیاربدەی، لەكاتێك ئەو تۆی دروست كردووە).

گوتم : چی تر؟

فەرمووی: (زینا كردن لەگەڵ خێزانی دراوسێكەت) .

ئینجا الله بەڕاست دانانی ئەو قسانەی دابەزاند لە قورئاندا فەرمووی : ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا﴾ [**الفُرقَانِ** : ٦٨]

**٤١٨** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی زینا دەکات لەگەڵ حەڵاڵی دراوسێکەی ئەوا الله لەڕۆژی قیامەت سەیری ناکات، وە پاکی ناکاتەوە، وە پێی دەفەرمووێ : برۆ ناو ئاگر لەگەڵ ئەوانەی وا دەچنە ناو ئاگر).

**٤١٩** - أبو جعفر العدوي دەفەرمووێ : (دوو ئافرەت هەیە توخنیان ناکەوم لەبەر نزیکیان، خێزانی هاوڕێکەم و دراوسێکەی تەنیشتمان، ئەمما هاوڕێکەم من پەیمانی ناشکێنم، وە دراوسێکەشم الله ئامۆژگاری پێ کردووم).

**٤٢٠** - أبو عبدالله ی الجدلی دەفەرمووێ : پێغەمبەر ئەیوب علیه السلام دەیفەرموو : اللهم پەنا بەتۆ دەگرم لە دراوسێیەکەی کە چاوەکانی دەمبینێ، وە دڵیشی لەسەرمە -واتا چاودێریم دەکا-، گەر چاکەیەکم ببینێ ئەوا دەیشارێتەوە، وە گەر خراپەیەکیشم ببینێ ئەوا بڵاوی دەکاتەوە).

**٤٢١** - سلمانی فارسی رضي الله عنه دەفەرمووێ : (لە نیشانەکانی نزیکی قیامەت ئەوەیە کە فیتنەکان دەربکەون لەسەر ڕووی زەوی، وە سیلەی ڕەحم بپچڕێنرێ، وە دراوسێ ئەزیەت بدرێ).

٤٢٢ - عبدالله ی کوڕی الحارث دەفەرمووێ : أبو مسلم ئەسپێکی ڕەسەنی جوانی هەبوو نیشانی کۆمەڵێک برادەکانی دا، بەوانەی لەوێ بوون پێی گوتن : ئایا ئەوە بۆ چ شتێك باشە؟

گوتیان : بۆ بەرەنگاری دوژمن .

فەرمووی : نا، بەڵکو بۆ ئەوە باشە پیاو سواری بێت و پێی ڕابکات لە دراوسێی خراپ).

٤٢٣ - مالک دەفەرمووێ : (خانوو دەگەڕێنرێتەوە لەبەر دراوسێی خراپ - ماڵ دەگوازرێتەوە - ) .

٤٢٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێك دەرگاکەی دابخات لەسەر دراوسێکەی لە ترسی ماڵ و خێزانەکەی ئەوا ئەو دراوسێیەی ئیماندار نیە، وە ئیماندار نیە ئەو کەسەی دراوسێکەی پارێزراو نەبێت لە شەڕی).

٤٢٥ - عبدالله ی کوڕی سلام رضي الله عنه دەفەرمووێ : پیاوێک هاتە لای رسول الله ﷺ و گوتی : ئەی رسول الله، دراوسێکەم ئازارم دەدات .

پێی فەرموو : (ئارام بگرە) .

دیسان دووبارەی کردەوە دیسان فەرمووی : (ئارام بگرە) .

بۆجاری سێیەم وایگوت، دیسان فەرمووی : (ئارام بگرە) .

بۆ جاری چوارەم وایگوت، ئەویش فەرمووی : (ماڵەکەت هەڵبگرە و بیبە لەسەری کۆڵان دایبنێ ئەگەر هەر کێ هات بڵێ دراوسێکەم ئازارم دەدات، ئینجا شایانی لەعنەت لێکردن دەبێت) .

---

: ئەم حدیثە ئەوەمان پێ دەڵێ کە هەرچی بوو هەر باش بین لەگەڵ دراوسێکەمان و ئارامی لەسەربگرین لە بابەکانی پێشوترگەربیرتان بێ لە حەدیثی ئەبو ذردەیفەرموو الله سێ کەسی خۆش دەوێ یەک لەوانە ئەمە بوو کە ئارام بگرێ لەسەردراوسێکەی، وە باش بوون لەگەڵ دراوسێ واجبە گەرچی کافر و مورتەدیش بێ بەڵام کافری محارب ئەوە شتێکی ترە و باش نابی لەگەڵی .

٤٢٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (پەنا بگرن بە الله لە شەڕی ئەو دراوسێیەی لەگەڵت نیشتەجێیە، ئەوەی موسافیر بێت - وەك کرێچی ئەمرۆ مەبەست - ئەوا دەڕوات) .

٤٢٧ - عکرمة دەفەرمووێ : (ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە شتانێک لە ئەبوو هورەیرەوە گوێم لێبووە؟

گوێم لێبوو دەیفەرموو : با دراوسێ ڕێگری لە دراوسێکەی نەکات کە دارێك بکوتێ بە دیوارەکەیدا) .

**٤٢٨** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (با هیچ کام لە ئێوە ڕێگری لە دراوسێکەی نەکات کە کۆڵەکەی خۆی لەسەر دیواری ئەو دابنێ، وە گەر ڕاجیاواز بوون لەسەر ڕێگایەک کە یەکلای نەبوبویەوە بۆ هیچتان ئەوا بیکەن بە حەوت بەش) واتا حەوتی تۆ و حەوتی ئەو.



## باب : (٢٢)

## چی هاتووه دەربارەی حەڕامێتی لە هەڵوەشاندنەوەی پەیمان و چوون بەرەو غەدر کردن



٤٢٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەوکاتەی الله سەرەتا و کۆتایی بەندەکانی کۆکردەوە ئاڵا بەرز دەکرێتەوە بۆ هەموو ئەوانەی غەدریان کردووە، دەگوترێ : ئەوە غەدری فڵانی کوڕی فڵانە).

٤٣٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (پارێزەری موسڵمانان هەمووی یەکە، وە بۆ هەموو کەسێك کە غەدر دەکات ئاڵایەکی هەیە پێی دەناسرێتەوە).

٤٣١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئاگاداربن بۆ هەموو ئەو کەسانەی غەدریان کردووە ئاڵایەك هەیە بەقەدەر غەدرەکەی لە ڕۆژی قیامەتدا).

**٤٣٢** - معاذ بن جبل رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ پێی فەرمووم : (ئامۆژگاریت دەکەم بە تەقوای اللّٰه، وە ڕاستگۆیی لە قسە کردندا، وە وەفاکردن بە پەیمانەوە) .

**٤٣٣** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (ئاڵای ئەوکەسەی غەدر دەکات بە کەمەریەوە بەستراوە).

**٤٣٤** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێ بمرێت و پەیمانی شکاندبێت، لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ بەڵگەیەکی پێ نیە).

**٤٣٥** - إبن عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (هیچ قەومێک نیە کە پەیمانیان هەڵوەشاندبێت ئیلا اللّٰه ﷻ دوژمنی بەسەردا زاڵ کردوون).

**٤٣٦** - میمونی کوڕی مهران دەفەرمووێ : (سێ شت بگەیەنەجێ بەرامبەر چاکەکاربێت یان خراپەکار : سیلەی ڕەحم بگەیەنە چاکەکار بێت یان خراپەکار، وەفا بە پەیمان بکە گەر کەسی بەرامبەر چاکەکار بێت یان خراپەکار، وە ئەمانەت بیگەیەنەوە شوێنی خۆی گەر کەسەکە چاکەکار بێت یا خراپەکار).

**٤٣٧** - سلیم کوڕی عامر دەفەرمووێ : (لە نێوان معاویە ی کوڕی سوفیان رضي الله عنه لەگەڵ قەومێک لە ڕۆمەکان پەیماننامە هەبوو،

ئیمامی معاویەش لە سنوری ئەوان دەسوڕایەوە تاوەكو كاتی پەیمانەكە كۆتایی دەهات، ئینجا بەسەری دادان، پیاوێكیش لە قەڵاوە بانگی كردن و گوتی : وەفا بە پەیمانەوە بكەن و غەدر مەكەن، وەفا بنوێنن و غەدر مەكەن، گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو : (هەر كەسێك لە نێوان خۆی و قەومێك پەیمان هەبوو با عەقد هەڵوەنەشێنێ و نەیشكێنێ با بەردەوام بێت تا كاتی تەواو دەبێت، با ئەوكات پێیان ڕابگەیەنێ لەسەر ئەوشتە) تەماشامان كرد ئەو پیاوە عمروی كوڕی عبسة بوو).

**٤٣٨** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (چوار نیشانە هەیە لە هەركەسێك دا هەبێت ئەوا منافقە، كە قسەی كرد درۆ بكا، ئەگەر پەیمانی دا غەدری لێبكات، وە ئەگەر موناقەشەی كرد سنور ببەزێنێ، وە گەر ئەمانەتی پێدرا خیانەتی لێبكا، هەر كەسێك نیشانەیەكی تێدابێت لەم نیشانانە ئەوا نیشانەیەكی نفاقی تێدایە).

---

**: سەبارەت بە جۆرەكانی پەیمان سێ جۆر پەیمانمان هەیە :**

**١- پەیمانی نێوان الله و بەندەكانی : كە الله لە پشتی باوكمانەوە پەیمانی لێمان وەرگرتووە كە هاوبەشی بۆبڕیارنەدەین و ئێمەش پەیمانمان داوە** ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ﴾ [الأعراف : ١٧٢]

٢ - پەیمانی نێوان دوو هاوسەرکە الله دەفەرمووێ : | وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا | [النِّسَاءِ : ٢١]

و اتا : ئێمە پەیمانێکی توووند و پتەومان لێوەرگرتوون لە نێوان یەکتریدا هەتانە .

٣ - پەیمانی نێوان دوو کەسی ئاسایی کە الله دەفەرمووێ : | وَأَوْفُواْ بِٱلْعَهْدِۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا | (الإِسرَاءِ : ٣٤)

و اتا : وەفا بکەن بە پەیمانەکانتان چونکە بەڕاستی لێی بەرپرسیارن .



## باب : (٢٣)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی شەرمی لێداماڵدراوە و لە حەڕامێتی و سەرزەنشت کراویەکەی



**٤٣٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو شتەی خەڵك بۆی ماوەتەوا لە کەلامی پێغەمبەران ئەگەر شەرمت نەکرد ئەوا چی دەکەی بیکە) .

---

و اتا : گەر شەرمت نەکرد هەموو شتێک دەکەی.

**٤٤٠** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو شتەی خەڵك پێی گەیشتووە لە کەلامی پێغەمبەران لە تەوڕات ئەگەر شەرمت نەکرد ئەوا چی دەکەی بیکە) .

**٤٤٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو شتەی خەڵك پێی گەیشتووە لە کەلامی پێغەمبەران ئەگەر شەرمت نەکرد ئەوا چی دەکەی بیکە) .

٤٤٥ - كثير بن أفلح دەفەرمووێ : (زیدی كوڕی ثابت هات بۆ جومعه خەڵك پێشیان لێی گرت دواتر كە ڕۆیشتن زید چوو نوێژی كرد لە شوێنێك و گەڕایەوە ماڵەوە و فەرمووی بەڕاستی هەر كەسێك شەرم لە خەلك نەكات شەرم لە الله ش ناكات) .

٤٤٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر الله بیەوێت كە بەندەیەك بە هیلاك ببات، ئەوا حەیای لێدادەماڵێ، ئەگەر حەیای لێداماڵدرا تۆ هەر پێی بگەیت لەسەر تاوان دەیبینی، ئەگەر هەر كاتیش پێی گەیشتیت لەسەر تاوان و قێزەونی بینیت ئەوا ئەمانەتی لێدادەماڵدرێ، ئەگەر ئەمانەتی لێداماڵدرا، پێی ناگەیت ئیلا دەبینی خیانەت دەكا و خیانەتكارە، گەر پێی گەیشتی خیانەتی دەكرد و خیانەت لەدڵی دابوو ئەوا رەحمەتی لێدادەماڵدرێ، ئەگەر ڕەحمەتی لێداماڵدرا ئەوا پێی ناگەی ئیلا دەبینی نارەحەتكارە یان لەعنەت دەكا، ئەگەر پێی گەیشتی ئیلا نارەحەتكەر بوو یان لەعنەتی دەكرد ئەوا ئیسلامەتیشی لێدادەماڵدرێ) .

٤٤٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر كەسێك حەیای نەبێت غەیبەتی بۆنیە) .

٤٤٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەركەس بەرگی حەیا و شەرم لەخۆی داماڵێ ئەوا غەیبەتی نیە) .

**٤٤٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (یەکەم شت لەم ئوممەتە بەرز ببێتەوە و نەمێنێ بریتین لە حەیا و ئەمانەت، ئێوە داوا لە الله بکەن پێتان ببەخشێ) .

**٤٥٠** - جبير كوڕی نفير دەفەرمووێ : (پێنج تایبەتمەندی هەیە لە پۆلێك لە خەڵکاندا ناشرینە، تووڕەیی لە دەسەڵاتدار، هەوڵدانی زۆر لەناو فەقیردا، گەنج بوونەوەی پیرەکان، بەخیلی و چرووکی لە دەوڵەمەندەکان، کەمی حەیا و شەرم لەناو کەسانی دیار - ناسراو- ) .

**٤٥١** - حذيفة ی یەمان رضي الله عنه دەفەرمووێ : (کۆتا شت کە پێی گەیشتبم لە وتەی پێغەمبەران ئەوەیە کە دەیانفەرموو: ئەگەر شەرمت نەکرد چی دەکەی بیکە)

---

: ئیمامی أحمدُ بنُ حَنبَلٍ دەفەرمووێ : (ئەگەر حەیا و شەرم لە مرۆڤ داماڵدرا ئەوا هەموو خێرێکی لێدادەماڵدرێ)

**مسائل إمام أحمد : ٣٧٩**

حەسەنی بصری دەفەرمووێ : ( حەیا و ڕێزگرتن دوو ڕەوشتن لە ڕەوشتی خێر، لە هیچ بەندەیەکدا نیە ئیلا الله ﷻ بەهۆیەوە بەرزی دەکاتەوە) -بەهۆی ڕێز و شەرم -

**مكارم الأخلاق إبن أبي دنيا : ٤٣**

الفُضَيلُ بنُ عِياضٍ دەفەرمووێ: : (پێنج ڕەوشت لە نیشانەی شەقاوەتە: دڵ ڕەقی، چاو وشکی لە فرمێسک، کەم شەرمی ، هەوڵدان بۆ دوونیا، هیوای درێژ)

**شعب الإيمان : ١٨٢/١٠**

حەکیمێك لە بەنی ئیسرائیل دەیگووت : (جوانی ئافرەت شەرمە، جوانی حەکیمیش بێدەنگیە) .

**الصمت لإبن أبي دنيا : ٢٦٣**



## باب : (٢٤)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی حەڕامێتی بڵاوکردنەوەی تاوان لەناو خەڵکیدا



**٤٥٢** - العلاء بن بدر دەفەرمووێ : (اللّٰه قەومێک سزا نادات کە تاوانەکانیان دەشارنەوە).

**٤٥٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەموو ئوممەتەکەم شایانی لێخۆشبوونە ئیلا ئەوانە نەبن بە ئاشکرا تاوان دەکەن، وە ئاشکرا کردنی تاوان بریتیە لەوەی کە پیاوێك هەڵەیەک بکات ئینجا بڵاوی بکاتەوە).

**٤٥٤** - عثمان بن أبي سودة دەفەرمووێ : (بۆ هیچ کامتان درووست نیە ستری اللّٰه لەخۆی داماڵێت، گوتیان ئایا چۆن ستری اللّٰه لەخۆی لادەدات؟

فەرمووی : (پیاوێك تاوانێک دەکات اللّٰه دایدەپۆشێت لەسەری، بەڵام دەچێت لای خەڵک باسی دەکات).

**٤٥٥** - أبي إدريس دەفەرمووێ : (اللّٰه ﷻ ستری بەندەیەک لانادات گەر بە قەدەر یەك مسقالە زەرە خێری تێدا مابێت).

**٤٥٦** - بلال إبن سعد بن وقاص دەفەرمووێ : (ئەگەر تاوان شاردرایەوە زەرەر ناگەیەنێت ئیلا بەو کەسە نەبێت کە ئەنجامی داوە، وە ئەگەر ئاشکرا کرا زەرەر لە تاک و کۆمەڵگا ش دەدات).

**٤٥٨** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (هیچ خەڵکانێك نیە لە پشتیانەوە کە تاوان ئەنجام دەدرێت، ئەوانیش دەسەڵاتیان هەبوو و دەیانتوانی ڕێگریان لێبکەن، بەڵام نەیانگۆڕی، ئەوا ئیلا اللّٰه ﷻ توشی سزایان دەکات).

**٤٥٩** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (نموونەی ئەوەی تاوان دەکات و ئەوانەی تاوان ناکەن، وەك کۆمەڵێک وان کە لە ناو کەشتیەك بن لەسەر بەحر، کۆمەڵێکیان دەچنە لای سەرەوە، کۆمەڵێکیان دەچنە لای ژێرەوە، ئەوانەی لە خوارەوەن تینوو دەبن دەچن ئاو لە لای بەشی سەرەوە دەهێنن، بەم شێوەیە ئەزیەتی بەشی سەرەوە دەدەن، ئەوانەی لەبەشی سەرەوەن دەڵێن : چیتر ناهێڵین بەلای ئێمەدا تێبپەڕن و ئاو ببەن، ئەوانەی لە خوارەوەن دەڵێن مادام ئێوە گەر ڕێگریمان لێبکەن کە ئاو لای ئێوە بهێنین ئەوا لە خوارەوە کەشتیەکە کون دەکەین و ئاو دەخۆینەوە، ئەگەر ئەوانەی لە سەرەوەن

دەستیان بگرن ئەوا هەموویان ڕزگاریان دەبێت، گەر وازیشیان لێبهێنن ئەوا هەموویان نوقم دەبن) .

---

: ئەمە نموونەی ئەم فەرمایشتەی الله یەکە دەفەرمووێ : ئێوە یارمەتی یەکتربدەن لەسەرچاکە و تەقوا، یارمەتی یەکترمەدەن لە تاوان و دووژمنداری .

**٤٦٠** - مريم إبنة طارق دەفەرمووێ : (ئافرەتێک بە عائیشە خاتوون رضي الله عنها گووت : مێر منداڵێک قاچی گرت منیش لە ئیحرامدا بووم .

عائیشە خان رضي الله عنها فەرمووی : (پەنا بە الله لەو شتە، وە پشتی لە ئافرەتەکە کردوو بەدەستی ئیشارەتی کرد کە قسە مەکە، ئینجا فەرمووی : ئەی ئافرەتانی ئیمانداران، ئەگەر یەکێك لە ئێوە تاوانێکی ئەنجام دا، با بە خەڵکی ڕانەگەیەنێت، وە داوای لێخۆشبوون بکات لە لای الله، وە تەوبەی لێبکات، چونکە بەندەکان خەڵک عەیبدار دەکەن و نایگۆڕن، بەڵام الله دەیگۆڕێت و عەیبداری ناکاتەوە).

---

: سەبارەت بە بڵاو کردنەوەی تاوان بەداخەوەین ئەمڕۆ زۆر بەربڵاوە لەکاتێکدا کە سزای زۆرتووندی لەسەرە وەك لەسەرەوە ئاماژەی پێکرد، وە الله ﷻ دەفەرمووێ :

| إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ | (النُّورِ : ١٩)

و اتا : ئەو انەی حەزدەکەن تاوان لە نێو ئیمانداران بڵاوبێتەوە سز ایەکی بە ئازاریان بۆ هەیە لە دوونیا و لە قیامەتیشدا، اللّٰه خۆی باشتر دەزانێت سزاکە چۆنە ئێوە نایز انن).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ : | إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَرَهُمْۚ وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ | (يسٓ : ١٢)

و اتا : ئێمە مردوو زیندوو دەکەینەوە، وە ئەوەی پێشی خستووە هەمووی بۆدەنوسین و ئەوەشی لەدوای جێماوە،هەموو شتێکمان لە کتێب و نامەیەکی ئاشکرادا ئامادەو تۆمارکردووە .

وە رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : " مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً سَيِّئَةً كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ " .

هەرکەسێك شتێکی خراپ دابهێنێت، ئەوا تاو انی خۆی لەسەرە، وە تاو انی ئەوەشی کە کاری پێدەکات لە دوای ئەو، بەبێ ئەوەی لە تاو انی هیچ کامیان کەم بکات .



## باب : (٢٥)

## چی هاتووە دەربارەی پیاوێك كە پیاوان دەچنە لای خێزانی لە تاوان و حەڕامێتیەكەی



٤٦١ - مالك بن أخمير رضي الله عنه دەفەرمووێ : گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو : (بەڕاستی الله ﷻ لە ڕۆژی قیامەتدا نە فەڕز نە سوننەت لە الصقور وەرناگرێت) .

گوتیان : الصقور كێیە ئەی رسول الله ﷺ؟

فەرمووی : (ئەو كەسەیە كە پیاو دەچێتە لای خێزانی) .

٤٦٢ - حەسەنی بصری لە تەفسیری ئەم حەدیثە (صرف و عەدلی لێ قەبووڵ ناكرێ) .

دەفەرمووێ : الصرف : واتا تەوبە، العدل :فیدیەیە.

٤٦٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (الله ﷻ سێ شتی به دەستەکانی دروست کردووە : أدم ی درووست کرد به دەستی خۆی، وە تەوراتی نوسی به دەستی خۆی، وە بەهەشتی فیردەوسی ڕازاندۆتەوە ، وە فەرمووی : سوێند به عیزەتی خۆم، نابێ نیشتەجێ ببێت کەسێك ئاڵودەی مەی بێت وە نه دیوثیش).

گوتیان : ئەی رسول الله ﷺ زانیمان ئاڵودەی مەی چیه بەڵام ئایا دیوث چیه و کێیه؟

فەرمووی : (ئەو کەسەی خراپەی خێزانەکەی قەبووڵ دەکات) .

---

: ئەمەش مانای ئەوەیە کە نەوەك خۆی ڕەزامەندی دەربڕێ بەڵکو کە مونکەرێك دەبینێ لە خوشکی لە دایکی لە خێزانی لە محرمەکانی بەگشتی ئەو خۆی بێدەنگ دەکات و هەڵوێستی نابێت، ئەوە ناچێتە بەهەشت جا چ بگات به یەکێك کە ڕازیە و یان خۆی دەچێ پانتۆڵ و جلی تەسك و ڕووت بۆیان دەکڕێت یان پارەیان پێدەدات ئەمە قورستر.

٤٦٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ کەس ناچنە بەهەشتەوە : ئەو کەسەی ئەزیەتی دایك و باوکی بدات، وە دیوث - گەواد - ، وە ئەو ئافرەتەی لاسایی پیاوان دەکاتەوە) .



## باب : (٢٦)

## ئەوەی هاتووە لەسەر حەڕامێتی شانازی کردن بە جووت بوون و بڵاو کردنەوەی ئەوەی کە دەچێتە لای خێزانی خۆی



٤٦٧- رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (الشياع حەڕامە)، واتا : شانازی کردن بە جووت بوون .

٤٦٨ - ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ چوە مزگەوت، وە کۆمەڵێک ئافرەتی ئەنصاری لێبوو، ئامۆژگاری کردن، وە بیریشی هێنانەوە، وە فەرمانی پێکردن کە چاکە ئەنجام بدەن، وەلەو گەربێت و لە زێڕی خۆشتان بێت، ئینجا فەرمووی : (ئاگاداربن سەرپێچی کردنە کە ئافرەتێك بە خەڵکی ڕابگەیەنێت کە بە تەنیایە لەگەڵ پیاوەکەی چی دەکات، ئاگاداربن کە پیاو نابێت بە خەڵکی ڕابگەیەنێت کە کاتێك بە تەنیایە لەگەڵ خێزانەکەی چی دەکات) ئینجا ئافرەتێکی دەم و چاو پڕ و بە

تەمەن هەڵسایەوە و گوتی : واللەهی پیاوەکان وادەکەن، وە ئافرەتەکانیش وادەکەن - و اتا ئەوان هەموویان ئاشکرای دەکەن - .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەو شتە مەکەن، ئایا پێتان ڕابگەیەنم نموونەی ئەوە وەك چی وایە؟ نموونەی وەك شەیطانێکی نێرە کە لە ڕێگا دەگات بە شەیطانێکی مێینە، جووت دەبێت لەگەڵی، وە خەڵکیش سەیریان دەکات).

**٤٦٩** - عبداللە ی کوڕی عمر رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ قەدەغەی لەوە کردووە کە پیاو لەگەڵ خێزانەکەی جووت ببێت و لەو شوێنەدا کەسێك هەبێت، تەنانەت منداڵیشی لێبێت لەناو لانك دا) .

---

: فەرموودەکە مونکەرە ووەرناگیرێت بەڵام دەبێ ژن و پیاو ستری خۆیان بکەن لەکاتی جووت بووندا .



# باب : (٢٧)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی نێربازی لە بێزراویەکەی و توووندی سزاکەی



٤٧١ - رسـول الله ﷺ دەفەرمووێ : (اللّٰه ﷻ حەوت لەعنەتی کـردووە لە دروست کراوەکانی لە ئاسمانی حەوتەمەوە، لەعنەتەکە سێ جار بەر یەکێکیان کەوتووە، وە لەعنەتی لە هەموو ئەوان کـردووە تاك بە تاك، فەرمووی: نەفرەت لێکراوە نەفرەت لێکراوە نەفرەت لێکراوە ئەوەی ئیشی قەومی لـوط بکات، وە مەلعونە ئەو کەسەی بچێتە لای گیاندارەکان - واتا فاحیشەی لەگەڵ بکات - ).

٤٧٢ - رسـول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێك فاحیشە و کاری قەومی لوطی کرد بیکوژن) .

٤٧٣ - رسـول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەستان بینی نێربازی دەکرد وەك قەومی لـوط ئەوا ئەوەی سەرەوە وئەوەی خوارەوە بەرد باران بکەن).

٤٧٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێکتان بینی کاری نێربازی دەکرد، ئەوا بکەر و ئەوەشی لەگەڵی دەکرێ بیکوژن).

٤٧٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بکەر و ئەوەشی لەگەڵی دەکرێ بیکوژن، وە ئەوەشی دەچێتە لای گیانداران، وە ئەو کەسەیشی دەچێتە لای مەحرەمی خۆی).

٤٧٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (الله لەعنەتی کردووە لەوەی دەچێتە لای گیانداران، وە الله لەعنەتی کردووە لەوەی ئیشی قەومی لوط دەکات - نێربازی - ) سێ جار ئەمەی گووتەوە .

٤٧٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (الله سەیری پیاوێک ناکات کە دەچێتە لای پیاوێک - جووت بوون - ، وە پیاوێکیش لە ڕێگەی دواوە بچێت بۆ ئافرەتەکەی) .

٤٧٨ - عبدالعزیز بن محمد دەگێڕێتەوە کە أبان فەرموویەتی لەسەر ئەم ئایەتە : | وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ | [هُودٍ : ٨٣]

فەرمووی : (هەر کەسێک نێربازی بکات وەك قەومی لوط دوورنیە کە ئەوەی بەسەر ئەوان هات بەسەر ئەمیش بێت) .

**٤٧٩** - سوفیانی ثەوری دەفەرمووێ : (ئەگەر پیاوێک مێرمنداڵێکی لای قاچیەوە دانابوو و بە پەنجەکانی قاچی یاری پێدەکرد ئەوا بزانە کەسێکی نێربازە).

**٤٨١** - دەربارەی ئایەتی : ﴿وَتَأۡتُونَ فِي نَادِيكُمُ ٱلۡمُنكَرَۖ﴾ **(العَنكَبُوتِ : ٢٩)** .

موجاهید دەفەرمووێ : ( لەناو کۆڕ و مەجلیسەکاندا کۆمەڵێکیان لەگەڵ کۆمەڵێکیان جووت دەبوون) .

**٤٨٢** - پرسیارکرا لە عطاء بن رباح دەربارەی چونە لای ئافرەتان لە ڕێگای کۆم ەوە، فەرمووی : (ئەوە کوفرە، قەومی لوط لەوەوە دەستیان پێکرد، چوونە لای ئافرەتان لە ڕێگای کۆم ەوە ئینجا پیاوەکانیان چونە لای پیاوەکان) .

---

: ئەوە کوفری بچوکە بەڵام گەربێت و حەڵاڵی بکات و بە ئاسایی بزانێت ئەوا کوفری گەورەیە و لەدین دەری دەکات .

**٤٨٣** - پرسیارکرا لە عبداللّٰهی کوڕی مبارك دەربارەی ئەوەی کە گەر یەکێك بیەوێ دەستدرێژی بکاتە سەر مێرمنداڵێك .

فەرمووی : (ڕێگری دەکات و بەرگری لە خۆی دەکات) .

گوتیان : گەر هاتوو ئەو زانی کە ڕزگاری نابێت ئیلا مەگەر بیانکوژێت؟ ئایا شەڕیکات و بکوژێت؟

فەرمووی : ( بەڵێ) .

---

: ئەویش درووستە و بەڵگەشمان ئەوەیە کە رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (**هەرکەس لەسەرناموسی بکوژرێت ئەوا شەهیدە**) گەربشیکوژێت هیچی لەسەرنیە.

٤٨٤ - کۆیلەیەک هات بۆ لای سوفیانی ثەوری و گوتی: من بەندەیەکی ئەوانەم و ئەوانیش داوای شتێکم لێدەکەن کە ناگونجێت - **مەبەستی ئەوەیە داوای نێربازیان لێکردووە** -

سوفیان فەرمووی : (بڕۆ تۆ ئازادی) .

٤٨٥ - محمد بن المنكدر و صفوان بن سليم و موسى بن عقبة دەفەرموون : (خالیدی کوڕی وەلید رضي الله عنه نامەیەکی بۆ ئەبووبەکری صدیق نوسی رضي الله عنه کە لە یەکێك لە دێهات و ناحیەکانی عەرەب پیاوێک هەیە کە جووت دەبن لەگەڵی وەك چۆن لەگەڵ ئافرەتان جووت دەبن، وە بۆ ئەم شتەش بەڵگەی ڕوون و ئاشکرامان بەدەستەوەیە، ئیمامی ئەبووبەکریش مشاوەرەی کرد بە هاوەڵانی رسول الله ﷺ کە توندترینیان قەولی ئیمامی عەلی بوو کە گوتی : ئەوە تاوانێکە کە

هيچ ئوممەتێک ئەنجامی نەداوە جگە لە یەك ئوممەت نەبێت، وە الله شتێکی بەسەر هێنان کە ئێوەش ئاگادارین و دەزانن، من وایدەبینم کە بە ئاگر بیانسوتێنین، هاوەڵان یەك دەنگ بوون و کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە بیانسوتێنن بە ئاگر، ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه نامەی ناردەوە بۆ خالد کوڕی وەلید کە بیانسوتێنێ، ئینجا عبدالله ی کوڕی زوبەیر لە سەردەمی خۆی سوتاندنی بە ئاگر - ئەو انەی و ایانکردبا - ، هشام بن عبدالملك یش سوتاندنی بە ئاگر، خالیدی القسری ش سوتاندنی لە عێراق).

٤٨٦ - عطاء ی کوڕی أبی رباح دەفەرمووێ : لەلای عبدالله ی کوڕی زوبەیر بووم رضي الله عنهما حەوت کەسیان هێنا کە لەسەر نێربازی گیرابوون، چوار دانەیان زەواجیان کردبوو پێشتر، وە سێ دانەشیان زەواجیان نەکردبوو پێشتر، فەرمانی کرد ئەو چوارەی زەواجیان کردوە لە مزگەوت دەریان بکەن و لە دەرەوە بەرد باران بکرێن، وە ئەمری کرد بە سێ دانەکەی تر کە حەددی زینایان لەسەر تەطبیق بکرێت و ابن عمر و ابن عباسیش لەوێ بوون نارەزاییان نەبوو).

٤٨٧ - شەعبی دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی ئیشی قەومی لوط ئەنجام بدات ڕەجم دەکرێت ، گەر زەواجی کردبێت یان نەیکردبێت).

٤٨٨ - سعيد بن المسيب دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی ئیشی قەومی لوط ئەنجام بدات ئەوا ڕەجم دەکرێت، هاوسەرگیری کردبێت یان نەیکردبێت).

٤٨٩ - إبراهیمی النخعی دەفەرمووێ : (حەددی کەسێک کە فعلی قەومی لوط بکات بریتیە لە هەمان حەددی زیناکار).

٤٩٠ - عطاء بن أبی رباح دەفەرمووێ : (حەدی زینای لەسەر جێبەجێ دەکرێ) .

٤٩٢ - إبن عباس رضي الله عنهما دەربارەی کەسێک کە دەچێتە لای گیاندارێک دەفەرمووێ : (هیچ حەدێکی لەسەر نیە) .

---

**: واتا لە قورئان و فەرموودە هیچ حوکمێك بە ئاشکرایی نەهاتوە لەسەری ، بەڵام تەمبێ کردنی لەسەرە و ئاژەڵەکەش دەکوژرێت.**

٤٩٣ - جابر کوڕی زید دەفەرمووێ : (کەسێك کە کرداری قەومی لوط بکات ڕەجم دەکرێت) .

٤٩٤ - عبیدالله بن معمر دەفەرمووێ: (دەکوژرێ ئەوەی ئیشی قەومی لوط بکات) .

**٤٩٥** - دایکمان عائیشه رضي الله عنها دەفەرمووێ: (یەکەم کەس کە تۆمەتبار کرا بەو ئیشە قێزەونە - **و اتا کرداری قەومی لوط** - لەسەردەمی ئیمامی عمر بن خطاب رضي الله عنه پیاوێك بوو تۆمەتبار کرا، ئیمامی عومەر فەرمانی کرد کەس لەگەڵی دانەنیشێ)

---

: سەبارەت بە حەدی ئەم ئیشەی قەومی لوط ئەوا وەك لە ئەثەرەکان ڕوونە زانایان دەفەرموون زەواجی کردبێت یان نا ئەوا دەبێت ڕەجم بکرێت ئەوەش قەولی شافعی و مالك و أحمد و إسحاق بن راهویە و کۆمەڵێکی ترە .

وەك ڕوونە کە هاوەڵان ڕەجمیان کردن و تێیدایە سوتاندوویانن .

ئەم ئیشەش ئەمڕۆ پەرەی پێدراوە کە بەداخەوە بەڵکو چۆتە ئاستی ئەوەی لەگەڵ گیانداران جوت ببن یان لەگەڵ فەرش و نازانم چی و چی سبحان الله کە مرۆڤ فیطرەتی تێکچوو بەمشێوەیە سەرگەردان دەبێت .

هەر کەسیش ئەم کارە ئەنجام بدات دوور نیە وەك ئەوانی لێبێت چونکە الله دەفەرمووێ : ئەوە لە زاڵم وستەمکاران دوورنیە .

وە سەرەتاکەشی بەم شێوە بوو کە لە ئەثەری عطاء بن أبی رباح هاتبوو کە ئەوان سەرەتا لە دواوە دەچوونە لای ئافرەتان دواتر چونە لای یەکتربەم شێوەیە بەردەوام بوون تا سزای الله پێیان گەیشت .

ئافرەت لەگەڵ ئافرەت خەریک بوو پیاو لەگەڵ پیاو

کە لە بابەکانی دواتر کۆمەڵێک حوکمی تروتاوانی تردێنە پێشمان کە ئەمڕۆ بەربڵاون، نسأل الله العافیە .

## باب : (٢٨)

## نەهی كردن لە چوونە لای ئافرەتان لە دواوە - كۆم - وە حەڕامێتی ئەو كردارە



**٤٩٦** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (اللّٰه شەرم لە حەق ناكات، مەچنە لای ئافرەتان لە پشتەوە) یان فەرمووی : (لە دواوەیان).

**٤٩٧** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی الله شەرم لە حەق ناكات، بۆ هیچ كەسێك حەڵاڵ نیە بچێت بۆ لای خێزانەكەی لە ڕێگەی دواوە).

**٤٩٨** - زوهری دەفەرمووێ : (پرسیارم كرد لە سعيد بن المسيب و أبا سلمة بن عبدالرحمن لەسەر ئەو بابەتە، ئەوانیش قەدەغەیان لێ كرد و پێیان حەڕام بوو، واتا بابەتی چوون بۆ لای ئافرەت لە ڕێگەی كۆم).

**٤٩٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (اللّٰه شەرم لە حەق ناكات، مەچنە لای ئافرەتان لە پشتەوە) یان فەرمووی : (لە دواوەیان).

**٥٠٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (الله سەیری پیاوێک ناکات جووت ببێت لەگەڵ پیاوێك، وە پیاوێکیش بچێتە لای خێزانەکەی لە ڕێگەی دواوە).

**٥٠٤** - إبن عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه هاتە لای رسول الله ﷺ و فەرمووی : ئەی رسول الله بەهیلاک چووم .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (چ شتێك بە هیلاکی بردیت؟)

ئەویش گوتی : چوومە لای خێزانەکەم لە دواوە - **بەڵام لەڕێگای داوێنەوە** - .

رسول الله ﷺ هیچ وەڵامی نەدایەوە، ئینجا الله وەحی کرد بۆ رسولەکەی : ﴿ نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ ﴾ **(البَقَرَةِ : ٢٢٣)**

رسول الله ﷺ فەرمووی : ( لەپێشەوە جووت بە لەگەڵی، لە دواوەش، وە خۆت بپارێزە لە - **کۆم** - وە لە کاتی سوڕی مانگانە).

**٥٠٥** - إبن عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (کۆمەڵێك لە خەڵکی حمیر هاتن بۆ لای رسول الله، پرسیاری کۆمەڵێك شتیان لێ کرد، کابرایەکیان گوتی : من خێزانەکانی خۆم خۆش دەوێ، الله ئایەتی دابەزاند و فەرمووی : ﴿ نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ ﴾ **(البَقَرَةِ : ٢٢٣)**

ئینجا رسول الله ﷺ فەرمووی : (بچۆرە لای خێزانت لە پێشەوە و لە دواوە، گەر جووت بوونەکە لە ڕێگای دامێنەوە بوو).

**٥٠٦** - عكرمة رضي الله عنه دەربارەی ئایەتی | نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ | (**البَقَرَة** : ٢٢٣)

دەڵێ : (دەچێت بۆ لای هەر چۆنێک بیەوێت، بەڵام ناچێت بۆ لای وەك چۆن قەومی لوط کردیان).

**٥٠٧** - بە طاوس کیسان گوترا کە پیاوێك دەچێتە لای ئافرەتەکەی لە ڕێگەی کۆم ەوە .

فەرمووی : ئەوە وەك زینایە .

**٥٠٨** - إبن عباس رضي الله عنهما دەربارەی ئایەتی | نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ | (**البَقَرَة** : ٢٢٣)

دەفەرمووێ : (دەچێتە لای بە وەستانەوە یان بە دانیشتنەوە، لە پێشەوە یان لە دواوە، هەر چۆنێک بیەوێت، بەڵام دەبێ لە ڕێگەی دامێنەوە بێت).

**٥٠٩** - پرسیار کرا لە عطاء بن رباح دەربارەی چونە لای ئافرەتان لە ڕێگەی کۆم ەوە .

فەرمووی : (ئەوە کوفرە، قەومی لوط لەوەوە دەستیان پێکرد، چوونە لای ئافرەتانیان لە کۆم ەوە ئینجا پیاوەکانیان چونە لای پیاوەکان).

٥١٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (الله شەرم لە حەق ناکات، مەچنە لای ئافرەتان لە پشتەوە) یان فەرمووی : (لە دواوەیان).

٥١١ - علي بن طلق دەفەرمووێ : کۆمەڵێک دەشتەکی هاتنە لای رسول الله ﷺ، وە گوتیان ئەی رسول الله ئێمە خەڵکی ئەم گوندەین، وە ئاویش تێیدا کەمە، وە یەك لە ئێمە با ی لێبەردەبێت .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەگەر یەك لە ئێوە بای لێبەربوو لەدواوە با دەست نوێژ بگرێتەوە، وە نەچنە لای ئافرەتان لە ڕێگەی کۆم ەوە ، بەڕاستی الله شەرم لە حەق ناکات).

٥١٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (الله سەیری پیاوێک ناکات کە لە ڕێگەی کۆم جووت بێ لەگەڵ خێزانەکەی).

٥١٤ - إبن شهاب دەفەرمووێ : (سعید بن المسیب و أبوبکر بن عبدالرحمن نەهیان دەکرد لە چوونە لای خێزان لە ڕێگەی کۆم، بە توندترین شێوە نەهیان لێ دەکرد).

٥١٥ - علي بن طلق دەفەرمووێ : (کۆمەڵێک دەشتەکی هاتنە لای رسول الله ﷺ، وە گوتیان ئەی رسول الله ئێمە خەڵکی ئەم گوندەین، وە ئاویش تێیدا کەمە، وە یەك لە ئێمە با ی لێبەردەبێت .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەگەر یەك لە ئێوە بای لێبەربوو لەدواوە با دەست نوێژ بگرێتەوە، وە نەچنە لای ئافرەتان لە ڕێگەی کۆم ەوە ، بەڕاستی الله شەرم لە حەق ناکات).



## باب : (٢٩)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی زینا لە بێزراویەکەی و توندی سزاکەی



**٥١٦** - غزوان بن جرير لە باوکیەوە دەفەرمووێ : (لای ئیمامی عەلی رضي الله عنه باسی داوێن پیسی دەکرا، ئیمامی عەلی فەرمووی : ئایا دەزانن کام زینایە لای الله ﷻ زۆر گەورەیە؟

گوتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران زینا هەمووی گەورەیە **- مەبەست پێی لە تاوان -** .

ئەویش فەرمووی : بەڵام من هەواڵتان پێ دەدەم بە گەورەترین زینا لە لای الله ئەوەیە کە پیاوێك لەگەڵ هاوسەری پیاوێکی موسڵمان زینا بکات، ئەو دەبێتە زیناکار، وە ئەو ئافرەتەشی لەو پیاوە موسڵمانە تێکدا، ئینجا لەسەر ئەو بابەتە فەرمووی : لە ڕۆژی قیامەتدا بۆنێکی زۆر پیس بەسەر خەڵکی دا بڵاو دەبێتەوە، هەتا چی مرۆڤی باش و خراپ هەیە پێی دەگات ئەم بۆنە، هەتا بە

هەر هەموویان دەگات، ئازار بە هەناسەی هەمووشیان دەگەیەنێ، بانگکەرێك بانگ دەکا هەموویان گوێیان لێی دەبێت، پێیان دەڵێ : ئایا دەزانن ئەم بۆنە چیە کە ئەزیەتی ئێوەی دا؟

دەڵێن : نا واللە نازانین، بەس ئەوەندە دەزانین کە بە هەموومان گەیشت.

پێیان دەگوترێ : ئەوە بۆنی دامێنی ئەو زیناکارانەیە کە بە زیناوە گەیشتوونەوە بە اللە، وە تۆبەیان لێی نەکردووە، ئەوجا دەیانبەن، بەڵام باسی نەکرد بۆ جەهەننەم دەیبەن یان بە هەشت).

**٥١٧** - رسول اللە ﷺ دەفەرمووێ : (ئەی کۆمەڵەی موسڵمانان، ئامان وریابن لە زینا، لەبەر ئەوەی شەش تایبەتمەندی تێدایە : سێ دانەی لە دوونیایە، وە سێ دانەی لە قیامەتە، ئەمما ئەوانەی لە دوونیادان بریتین لە : نەمانی قیمەت، وە بەردەوام لە هەژاریدا بوون، وە کورت بونەوەی تەمەن، وە ئەو سێ دانەیەی لە قیامەت : تورەیی اللە ﷻ، وە قورسی و خراپی حساب و کتاب، وە مانەوە بە نەمری لەناو ئاگر، ئینجا رسول اللە ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَفِي ٱلۡعَذَابِ هُمۡ خَٰلِدُونَ﴾ (المَائـِدَةِ : ٨٠)

**٥١٨** - رسول اللە ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی کە لەسەر زینا بەردەوامە وەك ئەو کەسە وایە کە بت دەپەرستێ).

**٥١٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (نموونەی ئەو كەسەی كە دادەنیشێت لەسەر فەرشی غائیب، وەك ئەوە وایە كە لە ڕۆژی قیامەت شێرەكان پڕی دەدەنێ).

**٥٢٠** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (كاتێك خەوتبووم كە دوو كەس هاتن بۆ لام، گرتمیان و بە ئاگایان هێنام، چوینە دەرەوە و گەیشتین بە شاخ و گردێك، پێیان گوتم : سەركەوە .

گوتم : ناتوانم .

فەرموویان : بڕۆ ئێمە بۆت ئاسان دەكەین، سەركەوتم تا گەیشتمە سەروی چیاكە، گوێم لە دەنگێكی زۆر توند بوو .

گوتم : ئەوە چیە ئەو دەنگە .

گوتیان : ئەوە قیژە و زەڕەی ئەهلی ئاگرە، ئینجا بردمیان، گەیشتم بە كۆمەڵێك كە زۆر ئاوسا بوون و بێزەلەت ببوون، وە بۆگەنێكی پیسیان دەهات، هەر دەتگوت بۆنی پیسایی و تەوالێتەكانە هێندە قێزەون بوو گوتم : ئەوانە كێن؟

فەرموویان : ئەوانە زیناكارانی پیاوان و زیناكارانی ئافرەتانن) .

**٥٢١** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو شەوەی شەو ڕەویم پێکرا، گەیشتم بە زۆرێك لە دروست کراوەکانی الله تعالی : ئافرەتانێکی تێدابوو کە بە سنگ هەڵواسرابوون، وە تێیدابوو بە قاچەکانیان، هاوار و دەنگیان دەهات وەك مانگا، گوتم : ئەی جبریل کێن ئەوانە؟

فەرمووی: ئەوانە ئەو ئافرەتانەن کە زینایان کردووە، وە منداڵەکانیان کوشتووە، وە میراتگرانیان بۆ پیاوەکانیان هێناوە لە غەیری خۆی - واتا منداڵی زینا - ) .

**٥٢٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ :(ئەوپەڕی توڕەیی الله لەسەر ئافرەتێکە کە یەکێك دەخاتە ناو کۆمەڵێك کە لە ئەوان نیە، وە دەیانکاتە هاوبەش لە ماڵیاندا، وە عەورەتیان نیشان دەدات) .

---

: واتا بە زینا ئەم ئافرەتە منداڵی لە پیاوێکی تر بوبێت بەم شێوەیە خوشک و مەحرەمەکانی ئەم مێردەی هەموو شتێکی لەسەرحسابە، چونکە دەبن بە نامەحرەمی ئەم منداڵە .

**٥٢٣** - عبداللّەی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : گوتم ئەی رسول الله چ تاوانێك لای الله زۆر گەورەیە؟

فەرمووی : (هاوبەش بۆ الله بڕیار بدەی لە کاتێکدا ئەو تۆی خەلق کردووە) .

گوتم : چی تر؟

فەرمووی : (زینا لەگەڵ ئافرەتی دراوسێکەت بکەی)

ئینجا الله تصدیقی کرد و ئایەت دابەزی کە فەرمووی : | وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا | **(الفُرقَانِ : ٦٨)**

**٥٢٨** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی زینا لەگەڵ ئافرەتی دراوسێکەی دەکات الله سەیری ناکات لە ڕۆژی قیامەت، وە پاکیشی ناکاتەوە، وە پێی دەڵێت : بڕۆ ناو ئاگر لەگەڵ ئەوانەی دەچنە نێو ئاگرەوە).

**٥٢٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ کەس الله قسەیان لەگەڵ ناکات، وە سەیریان ناکات، وە پاکیان ناکاتەوە، وە سزایەکی زۆر بە ئێشیان بۆ هەیە، پیرێکی زیناکار، دەسەڵاتدارێکی درۆزن، هەژارێکی لوت بەرز).

**٥٣٠** - ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه کاتێک ئایەتی الملاعنة دابەزی فەرمووی : (هەر ئافرەتێک یەکێك بخاتە ناو کۆمەڵەیەك کە لەوان نیە،

ئەوە هیچ پەیوەندیەکی نیە بە اللە وە، وە ناشیخاتە بەهەشتەکەی، وە هەر پیاوێکیش ئینکاری منداڵەکەی بکات و کە دەشزانێت کوڕی خۆیەتی، ئەوا اللە لە ڕۆژی قیامەتدا پەردە دەخاتە نێوان خۆی و ئەو، وە ڕیسوای دەکات لەبەردەم سەرەتای درووستکراوەکان تا کۆتایی دروستکراوەکانی).

**٥٣١** - عبدالرحمن کوڕی عثمان دەفەرمووێ: باوکم بۆی گێڕامەوە، لە دایکیەوە کە فەرمووی : (من لەگەڵ دایکی رائطة بووم کە کچی سوفیانە ئافرەتێکە لە هۆزی خزاعة، وە رسول اللە ﷺ بەیعەتی لێوەردەگرتین و دەیفەرموو : (بەیعەت بدەن لەسەر ئەوەی کە هاوبەش بۆ اللە بڕیار نەدەن، وە دزی نەکەن، وە زینا نەکەن، وە منداڵەکانتان نەکوژن، وە بوختان هەڵنەبەستن و نەبنە هۆکاری بوختان، وە سەرپێچی پیاوەکانتان نەکەن لە هەر شتێکدا) .

ئێمەش بێدەنگ بووین

رسول اللە ﷺ فەرمووی : (بڵێن بەڵێ، بەوەندەی لە تواناماندا هەبوو) .

گوتمان : بەڵێ لەوەندەی کە توانیمان .

منیش گوتم : هەروەك ئەو ئافرەتانە گوتیان .

دایکم گوتی: بڵێ بەڵێ .

گوتم : بەڵێ).

**٥٣٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر كەس بگاتەوە بە الله وە شەش شتی نەكردبێ دەچێتە بەهەشت هەر كەس بگاتەوە بە الله وە هیچ شتێكی نەكردبێتە هاوبەش لەگەڵی، وە دزی نەكردبێ، و زینای نەكردبێ، وە بوختانی بە ئافرەتی داوێن پاك نەكردبێ، سەرپێچی ئەوەی نەكردبێ كە سەرپەرشتیەتی، وە بە حەق قسەی كردووە،حەقی گووتوە، یان بێدەنگ بووە)

**٥٣٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر شەوی نیوەی مانگی شعبان هات، بانگكەرێك بانگ دەكات : ئایا كەس هەیە داوای لێخۆشبوون بكات لێی خۆش ببم، هیچ كەس هەیە داواكاری هەبێت پێی ببەخشم، هیچ كەس نیە داوا لە الله بكا پێی دەبەخشێ، ئیلا جگە لە ئەو كەسەی بە دامێنی زینا دەكات، و كەسی مووشریك).

**٥٣٤** - عبدالله ى كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : (ئەگەر لە تەرازوو فێڵ كرا ئەوا باران نابارێت - سوفیانی كوڕی عوەینە فەرمووی : ئەگەر خەڵكی زوڵمی لە یەكتر كرد - وە ئەگەر زینا بە ئاشكرا كرا ئەوا طاعون و پەتا تێیاندا پەیدا دەبێت، وە ئەگەر درۆ زۆر بوو ئەوا كوشتن زۆر دەبێت).

**٥٣٥** - عمرو كوڕی میمون الأودي دەڵێ : (مەیمونێك لە یەمەن زینای كرد، مەیمونەكان ڕەجمیان كرد، منیش لەگەڵ ئەوان ڕەجمم كرد).

علی کوڕی عاصم فەرمووی : ئەگەر جگە لە حصين ی کوڕی عبدالرحمن ئەوەی بۆ گێڕاباموایە ئەوا باوەڕم نەدەکرد).

**٥٣٦** - میمونی کوڕی مهران دەفەرمووێ : پیاوێک بە إبن عباسی گووت وە منیش لەوێ بووم گوتی : پیاوێك ئافرەتێک ماچ دەکا کە حەڵاڵی خۆی نیە.

إبن عباس فەرمووی : (ئەوە زینای دەمە) .

**٥٣٧** - عبداللّٰه ی کوڕی مسعود دەفەرمووێ : (بەڕاستی چاوەکان زینا دەکەن، وە دڵ زینا دەکات، وە دەستەکان، وە پێیەکانیش، وە لێوەکانیش، وە دەمیش، وە ئەوەی بەڕاستی دادەنێت یان بە درۆی دەخاتەوە دامێنە).

**٥٣٨** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (چاوەکان زینا دەکەن، وە دەستەکان زینا دەکەن، وە پێیەکان زینا دەکەن، وە دامێنیش زینا دەکات).

**٥٣٩** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (زینای چاوەکان بریتیە لە نەزەر، وە زینای زمان بریتیە لە قسە کردن، زینای دەستەکان بریتیە لە دەست لێدان، وە زینای قاچەکان ڕۆیشتنە بۆی، وە دامێن بە ڕاستی دادەنێ یان بە درۆی دەخاتەوە).

**٥٤٠** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (**هەر كەسێك ئافرەتێك هەڵبگێڕێتەوە لە مێردەكەی یان بەندەیەك لە خاوەنەكەی ئەوا لە ئێمە نیە**).

**٥٤١** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (**بۆ هەموو نەفسێك بەشی زینا نوسراوە و دیاریكراوە، چاوەكان زینا دەكەن، وە زینایان بریتیە لە سەیركردن، وە دەستەكان زینا دەكەن، وە زینایان بریتیە لە دەست لێدان، وە پێیەكان زینا دەكەن، زینای پێیەكانیش بۆی ڕۆیشتنە، وە دەم زینا دەكا، زینای دەمیش بریتیە لە ماچ، وە دڵیش حەزی بۆی دەچێ و تەماعی لێدەكا، وە بەڕاست دانەری ئەمە داوێنیەتی یان بە درۆی دەخاتەوە**).

**٥٤٢** - كعب ی أحبار بە إبن عباسی دەفەرموو : وریابە لە سێ شت گەر بینیتن : (شمشێرەكان دەرهاتن لە جێگەی خۆیان، وە خوێنی خەڵك ڕژێندرا پێی، ئەوا بزانە كە حوكمی الله لەناو چوە، كۆمەڵێكیان تۆڵە لە كۆمەڵێكیان دەكەنەوە، وە ئەگەر بینیت كە باران ڕاگیراوە ئەوا بزانە كە خەڵك زەكاتی مەنع كردووە، خەڵك ئەوەی لای خۆی گرتۆتەوە، الله ش ئەوەی لای خۆیەتی لێی گرتونەوە، وە ئەگەر بینیت كە دەرد و پەتا بڵاوبووبویەوە ئەوا بزانە كە زینا بڵاو بۆتەوە).

**٥٤٣** - ئەنەسی کوڕی مالک دەفەرمووێ : ئایا ئاگادارتان بکەمەوە بە حەدیثێك کە گوێم لێبووە لە رسول اللە ﷺ، وە کەس دوای من بۆتان نەگێڕێتەوە؟

فەرمووی : (بەڕاستی لە نیشانەکانی قیامەت بریتیە لە دەرکەوتنی نەزانی، وە بەرزبوونەوەی زانست، وە مەی دەخورێتەوە، وە زینا بەربڵاو دەبێت، وە ئافرەتان زۆر دەبن تا وایلێدێ بۆ پەنجا ئافرەت یەك پیاو هەیە ڕایانبگرێ - بەخێویان بکا - ) .

**٥٤٤** - رسول اللە ﷺ دوعای دەکرد و دەیفەرموو : (اللهم دڵم پاك بکەیتەوە لە نیفاق، وە دامێنم لە زینا، وە زمانم لە درۆ، و چاوەکانم لە خیانەت، بەڕاستی تۆ ئاگاداری خیانەتی چاوەکانی و ئەوەی شاردوشمانەوە لەناو دڵمان).

**٥٤٥** - رسول اللە ﷺ وتاری بۆ خەڵکی دەدا و دەیفەرموو : (دوو شت هۆکاری چوونە بەهەشتن : ئەوەی نێوانی ڕیشی و نێوانی قاچەکانی بپارێزێت).

**٥٤٦** - عائیشە خاتون رضي اللە عنها دەفەرمووێ : گوێم لە رسول اللە بوو ﷺ بە هاوەڵانی دەفەرموو : (ئایا دەزانن خەڵك زۆربەی بەهۆی چی دەچێتە ئاگرەوە؟) .

گوتیان : اللّٰه و رسولەکەی دەزانن .

فەرمووی : (دوو کونەکە : دامێن و دەم).

٥٤٧ - عکرمة رضي الله عنه دەفەرمووێ : (ئەگەر پیاو خۆی بە پیاو وەنا، یان دایکی، یان خوشکی، یان کچی، یان پووری ئەوا بەشێکە لە زینا).

٥٤٨ - سلمة بن قیس رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ پێی فەرمووم : (چوار شت بکە: هاوبەش بۆ اللّٰه بڕیار مەدە، دزی مەکە، وە زینا مەکە، وە ئەو نەفسە مەکوژە کە اللّٰه حەرامی کردووە).

٥٤٩ - رسول اللّٰه ﷺ فەرمووی : (شەش شتم لێوەربگرن بەهەشتتان بۆ پێش دەخەم) .

گوتیان : ئەوانە چین ئەی رسول اللّٰه؟

ئەویش فەرمووی : (ئەگەر یەکێك لە ئێوە قسەی کرد با درۆ نەکات، وە گەر بەڵێنی دا با پێچەوانەی نەکات، وە گەر ئەمانەتی پێدرا با خیانەتی لێنەکات، وە چاوتان بگرن و بپارێزن، وە دامێنتان بپارێزن، وە دەستتان بگرنەوە - و اتا دەست هەڵگرن لە تاوان و زوڵم - ).

٥٥٠ - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی اللّٰه ڕقی لە سێ کەسە: پیرێکی زیناکار، وە بەخیلێکی منەتکار، وە هەژارێکی بۆزاوی).

**٥٥١** بۆ **٥٥٤** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (زیناکار کاتێك زینا دەکات ئەو کاتە ئیماندار نیە) .

---

**: و اتا لە دائیرەی ئیمان دەردەچێت دەچێتە بازنەی موسڵمانێتی، تاوەکووازلە زیناکە دەهێنێت و تەوبە دەکات تێگەیشتنی ئەم فەرموودەیە بەم شێوەیە دەبێت نەوەك وەك خەواریج کە دەڵێن کافر دەبێت...**

**٥٥٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (زیناکار زینا ناکات و ئیماندار بێت، ئەگەر ئەو شتەی کرد ئەوا ئیمان لەدڵی دەچێتە دەرەوە، ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە الله تەوبەی لێوەردەگرێت).

**٥٥٦** - ئەبوو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرمووی : (زیناکار زینا ناکات، و ئەوکاتەی زینا دەکات ئیماندار بێت) .

ئەبوو سعید دەفەرمووێ : گوتم : ئەوە چۆن دەبێت ئەی رسول الله، .

ئەویش فەرمووی : (ئیمان لێی دەردەچێت، ئەگەر تەوبەی کرد الله تەوبەی لێوەردەگرێت) .

---

**: موسڵمانان ئەم بابەتە جوان لێی بڕوانن و لێی بفکرن بەڕاستی ئەم دەروازەیە زۆربەمان توشی بووینە پەنا دەگرین بە الله، کە بە سەدان حوکمی تری لێوەردەگیرێت بەڵام**

زۆر درێژە دەكێشێ حەزم نەكرد لەسەرتان درێژ بكەمەوە تەنیا بەكورتی یەك ئایەت دەڵێم كە الله ﷻ دەفەرمووێ : | **وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا** | [الإِسرَاءِ : ٣٢]

الله تعالى دەفەرمووێ : نزیكی زینا مەكەون بەڕاستی كارێكی قێزەون و ڕێگایەكی زۆرخراپە .

گەرتێ بفكرین الله نافەرمووێ : زینا مەكەن، بەلكو دەفەرمووێ نزیكی زینا مەكەون و اتا ئەو ڕێگایانەشی بۆی دەچێت نابێ نزیكی بكەوین جا چ بریتیە لە نەزەرلە تەنانەت ئاد ناردنیش بۆ ئافرەت یان لە ئافرەتەوە بۆ پیاو أعاذن الله . .



## باب : (٣٠)

## کەڕاهەتی ئەوەی مرۆڤی باوەڕدار پەشیمان ببێتەوە لە دیاریەکەی



٥٥٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی پەشیمان دەبێتەوە لەو دیاریەی بەخشیویەتی وەک ئەوە وایە ڕشانەوەی خۆی بخوات).

٥٥٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (حەڵاڵ نیە بۆ هیچ کەسێک دیاریەک ببەخشێت و لێی پەشیمان ببێتەوە، جگە لە باوک لەو شتەی داویەتی بە کوڕەکەی، وە نموونەی ئەوەی دیاریەک دەبەخشێت، دواتر لێی پەشیمان دەبێتەوە وەک سەگێک وایە، دەخوات تاکو تێر دەبێت و دەڕشێتەوە دواتر دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی خۆی و دەیخوات).

٥٦٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی لە دیاریەکەی پەشیمان دەبێتەوە وەک سەگێک وایە کە بگەڕێتەوە بۆ ڕشانەوەکەی، وە بۆ ئێمەش نموونەی وا ناشرین ناگونجێ) .

: واتا له مرۆڤی باوەڕدار ناوەشێتەوە کرداری لەم شێوەیە، بەڵکو رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (تهادوا تحابوا)، واتا دیاری ببەخشن خۆشەویستی زیاد دەبێت لە نێوانتان .

وە ئێمەی موسڵمان پێویستە موسڵمانان لەبیر نەکەین و دیاریان پێ ببەخشین، بە تایبەت لەم سەردەمە کە بەڕاستی طالب علمەکان زۆربەیان تواناى ماددیان نیە بۆکڕینی ئەم کتێبە دڵخوازەی هەیانە، ئێمەش لەوانەیە بتوانین کە کتێبێکمان لا پەسەند بوو دوو دانەی لێ بکڕین و دانەیەك بکەینە دیاری ئەوە شتێکی بچوکە، بەڵام لەلای ئەو موسڵمانە چاکەیەکی گەورەیە لەگەڵی بکەی، وە درووستە دیاری وەرگرتن لە موشریک و کافرانیش بەڵام بەو مەرجەی شتەکە حەڕام کراو نەبێت وەک سەربڕاوی دەستیان یان بەرازو کحول و جگەرە و باقی شتە حەڕامەکان، وە گەر دیاریەکت پێ بەخشرا کە ئەو شتە دزراو بوو ئەوا دروست نیە قەبووڵی بکەی بەڵکو دەبێ بیگەڕێنیتەوە و تێی بگەیەنیت کە حەڕامە، الله أعلم بالصواب.

٥٦١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی لە دیاریەکەی پەشیمان دەبێتەوە وەک سەگێک وایە کە بڕشێتەوە، دواتر بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی، وە بۆ ئێمەش نموونەی وا ناشرین ناگونجێت).

٥٦٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی پەشیمان دەبێتەوە لەو دیاریەی بەخشیویەتی وەک ئەوە وایە ڕشانەوەی خۆی بخوات).

٥٦٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک دیاریەک ببەخشێت، دواتر بڵێ بۆم بگەڕێنەوە ئەوا لە ڕۆژی قیامەت دەبێتە هۆی ڕاگرتنی).

٥٦٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی پەشیمان دەبێتەوە لەو دیاریەی بەخشیویەتی وەک ئەوە وایە ڕشانەوەی خۆی بخوات، وە ئەم نموونە ناشرینەش بۆ ئێمە ناگونجێت).

٥٦٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی پەشیمان دەبێتەوە لەو دیاریەی بەخشیویەتی وەک ئەوە وایە ڕشانەوەی خۆی بخوات).

٥٦٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو کەسەی پەشیمان دەبێتەوە لەو دیاریەی بەخشیویەتی وەک ئەوە وایە ڕشانەوەی خۆی بخوات).

٥٦٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (نموونەیئەوەی دیاریەک دەبەخشێت، دواتر لێی پەشیمان دەبێتەوە وەک سەگێک وایە، دەخوات تاوەک و تێر دەبێت و دەڕشێتەوە دواتر دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی خۆی و دەیخوات) .



## باب : (٣١)

## کەڕاهەتی ئەوەی پیاوێک لەگەڵ یەکێک قسە بکات وە کەسی سێیەمیان لەگەڵ بێت، تاکو دەبن بە چوار کەس



**٥٧٠** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (دوو کەس با قسە نەکەن بە نهێنی کەسی سێیەمیشیان لەگەڵ بێت).

**٥٧١** - عبداللهی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ نەهی لێدەکردین لەوەی کە گەر سێ کەس بووین دوانمان قسە بکەین بە جیا بەبێ ئەوەی سێیەم، تا تێکەڵی خەڵک دەبین لەبەر ئەوەی ئەو کەسە دڵگران دەبێت بەهۆی ئەوە).

**٥٧٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر سێ کەس بوون دووانتان بەجیا قسە مەکەن بەبێ هاوەڵی سێیەم) .

گوتیان : ئەی ئەگەر هاتوو چوار کەس بووین؟

فەرمووی : (كێشە نیە).

٥٧٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (دوو كەس بە چپە و نهێنی قسە ناكەن سێیەمیان لەگەڵ بێت).

٥٧٥ - عبداللهى كوڕی دینار دەفەرمووێ : لەگەڵ عبداللهى كوڕی عەمر چومە دەرەوە بۆ بازاڕ، پیاوێك ئەوی بینی و كارێكی پێی بوو و هات بە نهێنی پێی گووت، ئینجا فەرمووی : گوێم لێبووە لە رسول الله ﷺ كە فەرموویەتی : (دوو كەس بە نهێنی قسە ناكەن كەسی سێیەمیشیان لا بێت).

٥٧٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (گەر هاتوو سێ كەس بوون با دووانتان بە جیا قسە نەكەن بەبێ كەسی سێیەم).

٥٧٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر هاتوو سێ كەس بوون بە نهێنی قسە مەكەن بەبێ كەسی سێیەم، چونكە ئەو شتە دڵگرانی دەكات).

٥٧٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (دوو كەس بە جیا قسە ناكەن بەبێ هاوەڵی سێیەمیان - واتا دروست نیە - ) .



## باب : (٣٢)

# كەڕاهەتی ئەوەی پیاو بچێتە نێوانی دوو کەس یان تەداخولی نێوانیان بکات تاوەکو مۆڵەت وەرنەگرێت



**٥٧٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ: (حەڵاڵ نیە بۆ پیاوێک کە نێوانی دوو کەس جیابکاتەوە تا مۆڵەتیان لێوەرنەگرێت).

**٥٨٠** - سعیدی المقبری دەڵێت: (چومە لای إبن عمر ئەویش قسەی لەگەڵ یەکێک دەکرد چووم تا بچمە نێوان هەردووکیان، پاڵێکی بە سینگمەوە نا، منیش پێکەنیم وەك ئەوەی ئەقڵم لە دەست دابێت یان کەسێکی تەمبەڵ بم، ئەوە پێدەکەنیت لە کاتێك شتێکی نەفام و نەزانانەت کردووە، ئەگەر دوو کەست بینی قسەیان دەکردین مەچۆرە نێوانیان تا مۆڵەت وەرنەگریت).

**٥٨١** - نافع دەفەرمووێ : (إبن عمر قسەی لەگەڵ پیاوێک دەکرد، کەسێک هات ویستی بچێتە نێوانیان، ئەویش پاڵێکی بە سینگیەوە نا، وە

پێی فەرموو : (گەر دوو کەست بینی قسە دەکەن مەچوە نێوانیان، تا مۆڵەتیان لێ وەرنەگریت).

٥٨٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (نابێ بچیتە نێوان دوو کەس تا مۆڵەتیان لێوەرنەگریت).

٥٨٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لە نێوان دوو کەس دامەنیشە تا مۆڵەتیان لێوەرنەگریت).

٥٨٤ - عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێ : (گەر کۆمەڵێکت بینی قسەیان دەکرد ئەوا قسەیان پێ مەبڕە).

---

عوف الأحمسي دەڵێت : (هەرکەسێك گوێبیستی فاحیشەیەك بێت، پاشان بچێت بەناو خەڵکیدا بڵاوی بکاتەوە، ئەوا وەك ئەوە وایە خۆی یەکەم کەس بوبێت لەبەژداری کردنی لەم تاوانەدا) .

**الزهد لوكيع**

خالد کوڕی معدان دەڵێت : (هەرکەسێك ئەوە باسبکات کە چاوەکانی بینیویەتی و گوێکانی بیستویەتی، ئەوە یەکێکە لەوانەی کە پێی خۆشە فاحیشە و زینا بڵاو بێتەوە لەناو ئیمانداراندا) .

**تفسير الدر المنثور**

كاتێك گوێبیست دەبیت یان دەیبینیت فڵان ئافرەت یان فڵان پیاو توشی زینا بووە یان توشی لیواطە بووە یان نزیکی زینا بوەتەوە یان پەیوەندیەکیان هەیە، دەمت بگرەو بیشارەوە با نەبیتە یەکێك لەو کەسانەی کە بەدەمیان فاحیشە بڵاو دەکەنەوەو ببیتە شەریکە تاوان، وریابە لەوەی بەبیانوی خراپی سەردەمەوە هەرچی فاحیشە هەیە کە بینوتە و بیستوتە باسی بکەیت و خۆت بخەیتە ئەو تاوانە گەورەوە بەبێ ئەوەی خۆشت کردبێتت .



## باب : (٣٣)

# كەڕاهەتی ئەوەی هاتووە پیاوێک براکەی هەجر بکات لە سەرووی سێ ڕۆژ

: هەجرکردن و اتا نێوان بڕین و قسە لەگەڵ یەکترنەکردن.



٥٨٥ - ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه دەفەرمووێ : (کردارەکانی بەنی ئادەم نیشان دەدرێ لای الله ﷻ هەموو ڕۆژانی دوو شەممە و پێنج شەممە، لەو دوو ڕۆژەدا لە هەموو کەسێک خۆشدەبێت کە شیرکی بۆ الله بڕیار نەداوە، جگە لە کەسێک کە لەگەڵ برایەکەی ناکۆکیەك هەبێت دەفەرمووێ واز لەو دووانە بهێنن تاوەکو ئاشت دەبنەوە و پێک دێن).

٥٨٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوە هەموو ڕۆژانی دوو شەممە و پێنج شەممە، تێیدا الله لەوانە خۆش دەبێت کە هیچ هاوبەش و هاوەڵێکیان بۆ الله دانەناوە، جگە لە کەسێک لە نێوان خۆی و

برايەکەی ناکۆکیەک هەبێ، دەفەرمووێ وازیان لێبهێنن تاوەکو ئاشت دەبنەوە).

٥٨٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (الله تابلۆ و پەڕاوی هەیە، هەموو ڕۆژێک شەست و سێ جار سەیری دەکات، ڕەحم بە بەندەکانی دەکات، بۆ ئەو کەسانەی توندو و تیژیی و تووڕەییان هەیە بەیەکەوە هیچ پشکێکیان بەرناکەوێت)[2]

٥٨٨ - عبداللە ی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : (دوو پیاو نین لە ناو ئیسلامدا کە یەکتری هەجر بکەن، ئیلا یەکێکیان بە زاڵم دەردەچێت).

٥٩٠ - رسول الله ﷺ دەفەرموێ : (بۆ هیچ موسڵمانێک حەڵاڵ نیە براکەی هەجر بکات لەسەروی سێ ڕۆژ).

٥٩١ - عبداللەی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرموێ : (بۆ هیچ موسڵمانێک حەڵاڵ نیە براکەی هەجر بکات لەسەروی سێ ڕۆژ).

٥٩٢ - رسول الله ﷺ دەفەرموێ : (بۆ هیچ باوەڕدارێک حەڵاڵ نیە براکەی هەجر بکات لەسەروی سێ ڕۆژ).

**٥٩٣** - سعدى كوڕى أبي وقاص دەفەرمووێ : (بۆ هیچ موسڵمانێك حەڵاڵ نیە براكەی هەجر بكات لەسەروی سێ ڕۆژ).

**٥٩٤** - ئیبراهیمی كوڕی إسحاق دەفەرمووێ : گوێم لێبوو حەسەنی بەصری دەیفەرموو : (هەركێ ساڵێك براكەی هەجر بكات ئەوا وەك ئەوە وایە خوێنی ڕشتبێت) .

ئێمە زۆر ترساین و قوڕس بوو لەسەرمان، وە پرسیارمان لێكرد لەوەی كە دەیڵێت، گوتی ئەبوو عثمانی المدني گوتی : بۆی گێڕامەوە لە عمران بن أبي أنس، وە لە أبي خراش السلمي بۆی گێڕاوەتەوە لە رسول الله ـەوە ﷺ كە فەرموویەتی : (هەركەسێك براكەی هەجر بكات بۆ ماوەی ساڵێك ئەوە وەك ئەوە وایە خوێنی ڕشتبێت).

**٥٩٥** - أنس كوڕی مالك دەفەرمووێ : (پشت تێكردنی براكەت وەك دژایەتی كردنیەتی).

**٥٩٦** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئامان وریابن لە دژایەتی و توڕەیی لە یەكتر چونكە ئەوە داتاشەرە - داتاشەری ئیمان و چاكە - ).

**٥٩٧** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەجر كردن نیە لە سەرووی سێ ڕۆژەوە، هەر كەس زیاتر لە سێ ڕۆژ هەجری براكەی كرد و مرد دەچێتە ئاگرەوە) .

**٥٩٨** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بۆ باوەڕدار حەڵاڵ نیە كە براكەی زیاتر لە سێ ڕۆژ هەجر بكات، وە گەر سێ ڕۆژ تێپەڕی، پێی گەیشت ئەوا سەلامی لێدەكات، گەر سەلامەكەی وەڵام دایەوە ئەوا هاوبەشن لە پاداشتدا، گەر وەڵامی سەلامەكەیشی نەدایەوە، ئەوا موسڵمانەكەی تر بەری دەبێت لەم هەجرە، تاوانەكەیشی دەچێتە سەر ئەوەی تر - ئەوەی وەڵامی نەداوەتەوە - ).

**٥٩٩** - موجاهد دەفەرمووێ : (ئەو كەسەی كە خەتەنە نەكراوە ئەوا كرداری وەستاوە تا خەتەنە دەكرێت، وە ئەو كەسەی بە زوڵم نێوانی خۆی و براكەی هەجر كردووە ئەوا كرداری وەستاوە تا ئاشت دەبێتەوە).

**٦٠١** - رسول الله ﷺ دەفەرموێ : (بۆ هیچ موسڵمانێك حەڵاڵ نیە براكەی هەجر بكات لە سەروی سێ ڕۆژ).

**٦٠٢** - به عطاء كوڕی أبی رباح گوترا : (كه پیاوێك نەزری كردووە كه نەچێته لای براكەی، فەرمووی : (دەبێ بچێت بۆ لای ، وە نانی دە هەژار و دەست كورت بدات).

**٦٠٣** - أسامەی كوڕی زید رضي الله عنهما دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (كردارەكانی بەنی ئادەم هەموو ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە سەیر دەكرێت و بەرز دەكرێتەوە، الله لە گوناهەكان خۆش دەبێت، جگە لەم كەسەی كە سیلەی ڕەحمی قطع كردووە، یان ئەو كەسەی كە نێوانیان تێك چووە و توندی هەیە لەنێوان، هی ئەم دوو كەس و چینە دوا دەخرێت) .

وە أسامەی كوڕی زید رضي الله عنهما ڕۆژانی دوو شەممە و پێنج شەممە بە ڕۆژوو دەبوو دەیفەرموو : حەزدەكەم كردارەكانم نیشان بدرێن بە نامەی كردارم و من بە ڕۆژوو بم.

**٦٠٤** - لەبارەی ئایەتی | ﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ﴾ | [**لُقمَانَ** : ١٨] موجاهد دەفەرمووێ : (ئەوە پیاوێكە لەگەڵ برایەكەی دژبەیەك بوونێك یان تووڕەییەك هەیە، ئینجا پشتی تێدەكات).

**٦٠٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بۆ موسڵمان حەڵاڵ نیە براکەی هەجر بکات لە زیاتر لە سێ ڕۆژ، ئەم خۆی لادەدات، ئەویش خۆی لادەدات، وە باشترینیان ئەوانەیە کە لەپێشدا سەلام دەکەن).

**٦٠٦** - لە نێوانی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی و حوسێنی برای مناقەشەیەک درووست بوو، هەتاوەکو یەکتریان هەجرکرد، جا کە سێ ڕۆژ تێپەڕی بەسەر ئەوەدا حەسەن خۆی بە تاوانبار زانی لەسەر هەجری براکەی، چوو بۆ لای حسێن وە ئەویش دانیشتبوو، چوو بۆ لای سەری و ماچی کرد، کاتێک حەسەن دانیشت، حسێن پێی فەرموو : ئەوەی ڕێگری لێکردم لەوەی من بۆت هەڵبستم و دەستپێشخەری بکەم و سەلامت لێبکەم ئەوە بوو کە تۆ شایانتری بەم فەزڵە لەمن، وە حەزم نەکرد لە شتێک ڕکابەریت بکەم کە تۆ شایانتری پێی) .

---

**: واتا تۆ برا گەورەی منی حەزم کرد ئەم پاداشت وئەجرە بۆتۆبێت کە لە فەرموودەکانی سەرەوە باسکرا ئەوەی پێشڕەوی بکات ئەوا ئەجری زیاترە .**

**گەر سەیر بکەین رسول الله ﷺ لە فەرموودەکاندا دەفەرمووێ : هەجر کردنی براکەی، ئەوەش خۆی ڕوونە کە تەنیا بۆ موسڵمان حەڕامە پشت تێکردنی ئەویش لەسەردوونیا، بەڵام هەجرکردنی کافرو منافق و موشریک وکەسانێک کە مبتدعن ئەوە ئەصڵەن واجبە هەجر بکرێن و دانەنیشین لەگەڵیان و گەر بینیمان ڕێگای خۆمان بگۆڕین و سەلامیان لێنەکەین و تووندبین لەسەریان، وە موسڵمانێکیش کاتێک**

دەکەوێتە تاوانێکەوە گەر جارێك دووجار پێتگووت و هەر لەسەری بەردەوام بوو ئەوا پێویستە بۆ تەمبێ کردن و فێربوونی ئەوا دەبێت هەجری بکەیت، تەنانەت رسول الله ﷺ کعبی کوڕی مالك و هاوڕێکانی هەجرکرد بۆ ماوەی پەنجا ڕۆژوە ئەمریشی کرد کە هاوسەرەکانیشیان هەجریان بکەن و تێکەڵیان نەبن وکەس سەلامیشیان لێنەکات لەکاتێکیشدا موسڵمان بوون بەڵام بۆ ئەوە بوو کە تەمبێ بن و بزانن تاوان کردن چیە، وە عبداللەی کوڕی عمر دەیفەرموو: رسول الله ﷺ نەهی کردووە لەوەی بەرد وشت بهاوێژین بە پەنجەکانمان، یەک لە صحابەکان کۆمەڵێک بەردی دەستدایە و گوتی ئەوە چیە چەند بەردێکی هاوێشت، عبدالله فەرمووی: من حدیثت بۆ دەگێڕمەوە و تۆش وادەکەی؟ تا دەمریت قسەت لەگەڵ ناکەم و هەجرت دەکەم، بابەتەکان و فەرموودە و ئاثاری زانایان لەسەرئەم بوارە زۆرزۆرزۆرن بەڵام نامەوێ هێندە درێژبێت لەسەرتان، بە کورتی گوتم تێتان بگەیەنم ئەوەیە باسەکە تەنیا لەسەردوونیا حەڕامە برای موسڵمانی موەحیدت هەجربکەی، باقی ترڕوونکراوەتەوە، والله أعلم بالصواب.



# باب : (٣٤)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پیاوێک زەواج لەگەڵ باوەژنی خۆی بکات لە تاوان و سزاکەی



**٦٠٨** - لە معاویەی کوڕی قرة وە لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە : (کە رسول الله ﷺ باوکی ئەوی نارد وتا جد بن معاویة بۆ لای پیاوێک کە خێزانی باوکی خۆی مارەکردووە، کە لە گەردنی بدات و ماڵەکەی بکات بە پێنج بەشەوە).

**٦٠٩** - براء کوڕی عازب رضي الله عنه دەفەرمووێ : (گەیشتم بە خاڵم کە ئاڵایەکی پێبوو، گوتم : دەتەوێ بۆ کوێ بڕۆی؟

فەرمووی : رسول الله ﷺ منی ناردووە بۆ لای پیاوێک کە خێزانی باوکی خۆی مارە کردۆتەوە، لە گەردنی بدەم و ماڵەکەشی ببەم - بۆغەنیمەت -).

**٦١٠** - براء کوڕی عازب رضي الله عنه دەفەرمووێ : (کۆمەڵێک خەڵکم بینی دەڕۆیشتن، گوتم : بۆ کوێ دەڕۆن؟

گووتیان : رسول الله ﷺ ئێمەی ناردووە پیاوێک بکوژین کە خێزانی باوکی خۆی مارە کردۆتەوە).

**٦١١** - براء کوڕی عازب رضي الله عنه دەفەرمووێ : (مامم بە لامدا تێپەڕی - الحارث بن عمرو - گوتم : بۆ کوێ دەڕۆی؟ وە ئاڵایەکیشی پێبوو .

فەرمووی : (رسول الله ﷺ منی ناردووە بۆ لای پیاوێک کە خێزانی باوکی خۆی مارە کردۆتەوە، فەرمانی پێکردم بچم بیکوژم).

**٦١٢** - براء کوڕی عازب دەفەرمووێ : (أبو بردة ی خاڵم بەلامدا تێپەڕی و ئاڵایەکی پێبوو، گوتم : بۆ کوێ؟

فەرمووی : (رسول الله ﷺ منی ناردووە بۆ لای پیاوێک کە خێزانی باوکی خۆی مارە کردۆتەوە، منیش دەچم لە گەردنی دەدەم و سەری دەهێنم).



# باب : (٣٥)

## ئەوەی هاتووە لەسەر سنور بەزاندن - داوێن پیسی - لەگەڵ مەحرەمەکانی خۆت وە تاوانەکەی



٦١٣ - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی کە دەچێت بۆ لای مەحرەمێکی خۆی - و اتا داوێن پیسی لەگەڵ بکات - ).

٦١٤ - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (ئەوەی نێربازی دەکرد بکەر و ئەوەشی لەگەڵی دەکرێ بیکوژن، وە ئەو کەسەشی کە دەچێتە لای مەحرەمێکی خۆی).

٦١٥ - پیاوێکیان هێنا بۆ لای حجاج - شقي ئوممەتی ئیسلام - کە خوشکێکی خۆی گرتبوو و داوێن پیسی لەگەڵ کردبوو یان خۆی لێ تێر کردبوو، حجاجیش گوتی : (بیگرن و بزانن کێ لە هاوەڵانی رسول اللّٰه ﷺ لێرەیە پرسیاری لێبکەن لەسەر ئەم باسە، پرسیاریان کرد لە عبداللّٰه ی کوڕی أبی مطرف .

ئەویش فەرمووی : گوێم لە رسول الله بووە ﷺ دەیفەرموو : (هەر کەسێک نێوان دوو حەڕام کراو ببەزێنێ ئەوا لە ناوەندەوە جیای بکەنەوە بە شمشێر) .

ئینجا نامەی بۆ عبدالله ی کوڕی عباس نوسی رضي الله عنهما پرسیاریان لێکرد لەسەر ئەم شتە ئەویش وەڵامی دانەوە بە هەمان شێوەی عبداللهی کوڕی أبي مطرف).

٦١٦ - بکر بن عبدالله المزني دەفەرمووێ : (کە پیاوێک زەواجی کردبوو لەگەڵ پوری، ئەوەش بەرز کرایەوە و گەیشت بە عبدالملك بن مروان، کابراش گوتی : وامزانی بۆم حەڵاڵە و کێشەی نیە .

عبدالملك گوتی : (نەزانی نیە لە ئیسلامدا)

ئینجا لە گەردنی دا) .

٦١٧ - ابن عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی ئاڵودەی مەی بێت، وە ئەو کەسەی ئەزیەتی دایک و باوکی دەدا، وە کەسی منەتکاریش) .

أبو سلمةش ئەوەشی زیاد کرد کە (ئەوەش ناچێتە بەهەشت کە زینا لەگەڵ مەحرەمی خۆیدا بکات) .



## باب : (٣٦)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سەرسام بوون بە خۆت و خۆ بە گەورە زانین لە تاوان و گوناهەکەی



٦١٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەس لە ناخەوە خۆی بەگەورە بزانێت، وە لە ڕۆیشتنیشی بە پۆز بڕوات، کاتێک دەگاتەوە بە الله لێی تورەیە).

٦٢٠ - رسول الله ﷺ ڕۆژێک تفێکی لە پەنجەی شایەتوومانی دا و فەرمووی : (الله ﷻ دەفەرمووێ : خەریکە بێزارم دەکەی و عاجزم دەکەی ئەی بەنی ئادەم، لە کاتێکدا من تۆم درووست کردووە لە هاوشێوەی ئەمە، ئینجا جەستەشم بۆ ڕێک خستیت و نەخشەم کێشای، لە نێوان دوو جل دا دەڕۆیت بە پۆزەوە، وە بۆ ژێر زەوی مەوعیدێکت هەیە، ئینجا ماڵ و سامانت کۆ کردەوە و نەتبەخشی، هەتا ڕۆحت گەیشت بە قوڕگت وە بە دەستەکانی ئاماژەی کرد بە پەنجەی بۆ قوڕگی خۆی - رسول الله وا ایکرد - ئینجا ئەی نەوەی ئادەم گوتت : بمگێڕەوە چاکە دەکەم. دەی کاتی چاکەکردنیش نەماوە) .

: لەم حەدیثەدا ئاماژە بەوە دەکات کە رسول الله پەنجەی خۆی بە تف کرد و اتا ئەی نەوەی ئادەم تۆم لە دڵۆپێکی ئاوا دروست کرد.

٦٢٢ - رسول الله ﷺ ڕۆژێک تفێکی لە پەنجەی شایەتوومانی دا و فەرمووی : (الله ﷻ دەفەرمووێ : خەریکە بێزارم دەکەی و عاجزم دەکەی ئەی بەنی ئادەم، لە کاتێکدا من تۆم درووست کردووە لە هاوشێوەی ئەمە، ئینجا جەستەشم بۆ ڕێک خستیت و نەخشەم کێشای، لە نێوان دوو جل دا دەڕۆیت بە پۆزەوە، و زەوی شکاتی لێت دەکرد، مەوعیدێکت هەیە، ئینجا ماڵ و سامانت کۆ کردەوە و نەتبەخشی، هەتا ڕۆحت گەیشت بە قورگت وە بە دەستەکانی ئاماژەی کرد بە پەنجەی بۆ قورگی خۆی - رسول الله و ایکرد - ئینجا ئەی نەوەی ئادەم گوتت : بمگێڕەوە چاکە دەکەم، دەی کاتی چاکەکردنیش نەماوە) .

٦٢٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (الله ﷻ دەفەرمووێ : خۆ بە گەورە زانین بەرگی بەشی سەرەوەی منە، وە گەورەییش بەشی خوارەوەی منە، هەر کەسێك لە هەر کامیاندا بەربەرەکانێم بکات ئەوا دەیخەمە ناو ئاگرەوە).

---

: ئەم حدیثانەی سیفاتی الله کە باس دەکرێت ئێمە وەک ئەهلی سوننەت و جەماعەت وەریدەگرین بەو شێوەی کە هاتووە بۆمان بەبێ ئەوەی بیشوبهێنین بە هیچ لە مخلوقاتەکان و نابێ تەئویلی فاسد و بەتاڵیشی بۆ بکەین یان تحریفی بکەین وەک

گرووپە گومڕاکان، الله دەفەرمووێ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ [الشُّورَىٰ: ١١] هیچ شتێك وەك الله نیە و ئەویش زاتێکی بینا و بیسەرە.

٦٢٦ - محمد کوڕی المنكدر دەفەرمووێ: (لە ناو ئاگردا کۆشکێکی گەورە هەیە، ئەوانەی خۆیان پێ گەورەیە دەخرێنە ناوی، ئینجا دادەخرێت لەسەریان و سەرو خواریان پێدەکرێ).

٦٢٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ: (بوغزاوترینتان لای من، وە ئەوانەی مەجلیسیان لەمن دورە لە قیامەتدا بریتین لەوانەی: قسەی بەتاڵ زۆردەکەن، جنێو دەدەن، وە خۆ بەگەورە زانەکان).

٦٢٨ - دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ﴾ [القِيَامَةِ: ٣٣] مجاهد دەفەرمووێ: سەرسام بوو بە خۆی).

٦٢٩ - ئەبوو هورەیرە رضي الله عنەدەفەرمووێ: رسول الله ﷺ پێی فەرموو: (ئایا هەواڵت پێ بدەم بە سیفەتی ئەهلی ئاگر).

گوتم: بەڵێ.

فەرمووی: (هەموو ئەوانەی سەرسامن بە خۆیان، وە ئەوانەی خۆ بەگەورە زانن لە جەستە و لاشەیان، وە ئەوانەشی لە ڕووی دەرەوە خۆ بە گەورەزانن).

٦٣٠ - عبدالله ی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : (هەر کەسێک خۆی بە کەم بزانێت لە بەر ترسی الله، ئەوا الله بەرزی دەکاتەوە تا ڕۆژی قیامەت، وە هەر کەسێک خۆی بە گەورە بزانێت و پۆزاوی بێت، الله نزمی دەکاتەوە تا ڕۆژی قیامەت) .

٦٣١ - المفضل کوڕی المهلب دەفەرمووێ : (سلێمان کوڕی عبدالملك ناردی بە دوای مندا لە ڕۆژی هەینی، گوتی : چیت هەیە لەبەری بکەی لە ڕۆژی هەینی ؟ .

گوتم : ئەوەی لەبەرم کردووە ئەی ئەمیری باوەڕداران .

ئینجا گوتی : داوای جلێکی زەردی کرد، لەبەری کرد ئینجا گوتی : ئاوێنەم بۆ بهێنن کە هێنایان سەیری خۆی کرد، ئینجا جلەکەی دانا، دواتر داوای جلێکی سوری کرد، لەبەری کرد و ئینجا داوای ئاوێنەی کرد، بۆیان هێنا و سەیری خۆی کرد و ئینجا ئەم جلەشی دانا، ئینجا داوای جلێکی سەوزی کرد و بۆیان هێنا و لەبەری کرد، ئینجا داوای ئاوێنەی کرد کە بۆیان هێنا سەیری خۆی کرد و گوتی : من پاشام من گەنجم، من پاشام من گەنجم، ئینجا ڕۆیشت، منیش لەگەڵی ڕۆیشتم، چوویە سەر مینبەر، کاتێک وتاری دەدا، وەك بڵێی ئاگری گرت یان نەخوش بوو، لەسەر مینبەر هاتە خوارەوە و ژانە سەر گرتی، نەگەیشت بە جومعەی داهاتوو و مرد) .

**٦٣٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ: (هیچ بەنی ئادەمێک نیە ئیلا دوو زرێ و حەبلی هەیە بە سەریەوە: زرێیەک لە ئاسمانی حەوتەم، وە زرێیەک لە زەوی حەوتەم، ئەگەر ئەم بەندەیە خۆ بەکەم زانینی نواند ئەوا الله بەرزی دەکاتەوە بۆ ئاسمانی حەوتەم، وە گەر خۆی بە گەورە زانی ئەوا نزم دەکرێتەوە بۆ زەوی حەوتەم).

**٦٣٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ: (ناچێتە بەهەشت هەرکەسێك بە قەدەر مسقاڵێک زەڕە خۆ بە گەورە زانین لە دڵیدا هەبێت).

**٦٣٤** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ: (ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی بە قەدەر گەردێک خۆ بەگەورە زانین لە دڵی دا هەبێت).

پیاوێک گووتی: ئەی رسول الله ﷺ من حەزدەکەم پۆشاکەکەم خاوێن بێت، وە سەرم چەور بکەم، وە قەیتانی نەعلەکانم نوێ بێت، کۆمەڵێک شتی باس کرد، هەتا باسی ئەوەی کرد کە قامچی ئەسپەکەی پێ هەڵدەواسێ، گوتی: ئایا ئەمە خۆ بە گەورە زانینە؟

رسول الله ﷺ فەرمووی: (نا، ئەوە جوانیە، وە الله جوانی پێ خۆشە، بەڵام خۆ بە گەورە زانین ئەوەیە کە حەق بە سوک سەیر بکەی، وە خەڵکی ئەزیەت بدەی).

٦٣٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەھەشت ئەوەی بەقەدەر گەردێک خۆ بە گەورە زانین لە دڵیدا ھەبێت) .

پیاوێک گوتی : من پیاوێکم حەزم لە جوانیە، ھەتا لە قەیتانی نەعلەکانیشم، وە ئەو ئەڵقەی قامچی پێ ھەڵدەواسم .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەوە ھیچ پەیوەندی بە خۆ بەگەورە زانین نیە، بەڵام خۆ بە گەورە زانین ئەوەیە حەق بە کەم سەیر بکەی، وە خەڵکی بە سوک بزانی) .

٦٣٦ - لە محمدی کوڕی سیرینەوە رحمە الله دەفەرمووێ : (پێم گەیشتووە لە پیاوێکەوە وابزانم سوادی کوڕی عمرو بوو گوتی : ئەی رسول الله من جوانیم ھێندە پێدراوە کە وەک دەیبینی، وە حەزیشم لە جوانیە، ھەتا حەزناکەم کە ھیچ کەسێک جوانی لەمن زیاتر بێت تەنانەت قەیتانی نەعلەکانم و ئەو شتانەی تر ئایا ئەمە لە خۆ بەگەورە زانینە .

فەرمووی : (نا، بەڵام خۆ بە گەورە زانین ئەوەیە کە حەق ڕەت بکەیتەوە، خەڵک بە سوك سەیر بکەی) .

٦٣٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەھەشت ھەرکەسێك بە قەدەر مسقاڵێک زەڕە خۆ بە گەورە زانین لە دڵیدا ھەبێت) .

**٦٣٨** - الهيثم كوڕی المالك الطائي دەفەرمووێ : گوێم لە نعمانی كوڕی بەشير بوو رضي الله عنهما لەسەر مينبەر دەيفەرموو : شەيتان المصالي و فخوخي هەيە، وە مصالي و فخوخي شەيتان بريتيە لەوەی : ئينكاری كردنی نيعمەتەكانی اللّٰه، وە شانازی كردن بەوشتانەی اللّٰه پێی بەخشيوی، وە خۆ بە گەورە زانين لەسەر بەندەكانی اللّٰه، وە شوێن كەوتنی هەوا و ئارەزووی خۆتە بە بێ گوێڕايەڵی كردنی زاتی اللّٰه ﷻ) .

**٦٣٩** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (نوح عليه السلام بە كوڕەكەی خۆی فەرموو : كوڕەكەم من وەسيەتت بۆ دەكەم بە وەسيەت، وە بە كورتی پێت دەڵێم، تا لە بيری نەكەی، ئامۆژگاريت دەكەم بە دوو شت، وە قەدەغەت لێدەكەم لە دوو شت، ئەو دووانەی ئامۆژگاری و وەسيەتت دەكەم بينيومە زۆر نزيكت خەرەوەن لە اللّٰه ، وە بينيومە اللّٰه موژدەی بەوانە داوە كە ئەنجامی دەدەن و بە بەندە باشەكانی خۆی، ئەگەر توانيت بەردەوام زمانت تەڕ بێت پێيانەوە ئەوا وابكە؛ وتەی سُبْحَانَ اللّٰه وبحمده چونكە ئەو زيكرە دوعای مەخلوقاتەكانە، وە بەهۆی ئەم زيكرەشەوە بەندەكان ڕزقيان دەدرێت، وە زيكری لا إله إلا اللّٰه وحده لا شريك له، ئەگەر ئاسمانەكان و زەوی لە ئەڵقەيەكدا بێت ئەوا بەشی ئەو زيكرانە دەكات يان گەر لە ناو دەستەكانت بێ ئەوا بەڕاستی قورسترن لە ئاسمان و زەوی، وە ئەو دوو شتەی لێت قەدەغە دەكەم بريتين لە شيرك و خۆ بە گەورە زانين، ئەگەر توانيت بگەڕێتەوە بۆ لای

اللّٰه، وه لەناو دڵت دا بە قەدەر زەرِەیەک گەردێك شیرک و خۆ بەگەورە زانینی تێدا نەبێت ئەوا وابکە) .

٦٤٠ - (عبیداللّٰه کورِی عبداللّٰه کورِی عتبة چوە لای عمر کورِی عبدالعزیز، ئەو کات ئەمیری مەدینە بوو، وە عمر رِوی کردبوو لە عبداللّٰه کورِی عمرو کورِی عثمان بن عفان، بەهۆی ئەوەوە مەشغوڵ بوون نەیانتوانی وەڵامی سەلامی عبیداللّٰه بدەنەوە .

ئەویش - واتا عبیداللّٰه - گوتی :

دەست بدەن لەم خۆڵە کە ئێوە لێی دروست بوون، وە بۆ ئەوەش دەگەرِێنەوە و ئەوێ مصیرِتانە تا قیامەت، وە سەرسام مەبن بەوەی کە بەیەکەوە قسە دەکەن، مرۆڤ پرِ دەبێت لە شەرِ کە خۆ بەگەورە زانین رِووی تێکرد .

ئەوانیش رِوویان تێکرد و داوای لێبوردنیان کرد و گوتیان ئاگامان لێی نەبووە).

٦٤١ - أبا العباس محمد کورِی یزید المبرد هۆنراوەی دەگووت و دەیفەرموو : (ئەوە چیتە بۆ وەڵامی سەلامی ئەو کەسە نادەیتەوە کە سەردانیت دەکا ئیلا بە تیلەی چاو نەبێت، ئەوە تۆ وا دەکەی لە کاتێکدا هەر مرۆڤیت!؟، ئەی گەر مرۆڤ نەبوویتایە چیت دەکرد؟ تۆ هیچ نیت ئیلا

بەندەیەك نەبێت ئەگەر چی بێت و ببیت بە ئەمیر یان شتێکی تر، قەدەری اللّٰه ئاوابووە دەشتوانێت بتگۆڕێت بۆیە وریای خۆت بە).

٦٤٢ - یزیدی کوڕی معاویە دەڵێ: (ئەگەر پیاوێکت بینی زۆر مناقەشە و بەربەرەکانێ دەکرد و سەرسام بوو بەخۆی ئەوا بزانە خەسارەتمەندی تەواو تەواو کردووە).

٦٤٣ - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ: (ئەگەر هیچ تاوانێکتان ئەنجام نەدابوایە ئەوا دەترسام توشی شتێکی خراپتر ببن کە بریتیە لە سەرسام بوون بە خۆتان).

٦٤٤ - أبو موسا عمران کوڕی المؤدب دەفەرمووێ: خوێندوومەوە لە کۆمەڵێك لە کتێبی حەکیم و داناکاندا نوسرابوو: (هیچ کەسێك نیە کە خۆی بە گەورە بزانێت ئیلا لەبەر ئەوەیە لە ناخەوە خۆی بە زەلیلی دەبینێ، وە هیچ کەسێك خۆی بە کەم نازانێت ئیلا لەبەر شکۆ و عیزەتێك نەبێت کە لە ناخیدا هەیە).

٦٤٥ - أبا العباس یزید بن المبرد دەفەرمووێ: کۆمەڵێك لە داناکان فەرموویانە: (هەرگیز هیچ کەسێکمان نەبینیوە کە خۆی بە گەورە بزانێت لەسەر جگە لەخۆی، ئیلا بە ئەندازەی ئەم خۆ بە گەورە زانینە توشی زەلیلی دەبێت لەگەڵ کەسێك کە لە سەرووی خۆیەتی).

٦٤٦ - عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه دەفەرمووێ : (ئەگەر بەندە خۆی بەکەم بزانێت ئەوا الله حیکمەت و لێهاتوویی بەرز دەکاتەوە، وە فەرمووی : هەڵسە و بە ئاگابە، الله بە ئاگات بهێنێ، وە ئەگەر خۆی بە گەورە زانی ئەوا الله دەیگرێت و تەختی دەکات لەگەڵ زەوی - و اتا خەڵك بە کەمی دەزانێ و قیمەتی نامێنێ - ).

٦٤٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئێوە ئوممەتێکی ڕەحم پێکراون، پەلە مەکەن و سنور مەبەزێنن) .

٦٤٨ - رسول الله ﷺ دوعای دەکرد و دەیفەرموو : (اللهم پەنا بە تۆ دەگرم لە شەیطان وە لە دەست لێوەشاندنی شەیطان و شیعرەکەی و خۆ بە گەورە زانینەکەی).

٦٤٩ - عبدالله ی کوڕی سلام رضي الله عنه بە بازاڕدا ڕۆیشت و بارێک داری لەسەر سەری خۆی دانابوو، خەڵکی پێیان گووت : چی وایلێکردووی ئەم بارە دارە هەڵبگری؟ ئەی مەگەر الله دەوڵەمەندی نەکردوویت!؟

فەرمووی : بەڵێ، بەڵام دەمەوێ بەمە خۆ بەگەورە زانین لەسەر خۆم لابدەم، گوێم لێبووە رسول الله ﷺ دەیفەرموو : (ناچێتە بەهەشت ئەوەی بە قەدەر مسقاڵە گەردێک خۆ بەگەورە زانین لەدڵیدا هەبێت).

**٦٥٠** - أبي كوڕی كعب رضي الله عنه دەفەرمووێ : (خواردنی مرۆڤ نموونەیەكە بۆ بەنی ئادەم، خوێی پێدابكات و بیڕازێنێتەوە دواتر سەرئەنجامەكەی چیە - **چەندین گرنگیت پێدا و دواتر دەبێت بە پیسایی** - ، ئەگەر پیاوێكتان بینی خۆی دایە پاڵ جاهیلیەت و شانازی پێوە دەكرد ئەوا پێی بڵێن قەپ بكات بە گونی باوكی) .

**٦٥١** - پیاوێك هات بۆ لای رسول الله ﷺ، رسول الله ﷺ پرسیاری لێكرد : ( ئایا خواردنتان هەیە؟) .

گوتی : بەڵێ .

فەرمووی : (خاوێنی دەكەنەوە و ئامادەی دەكەن و دەیڕازێننەوە) .

گوتی : بەڵێ .

فەرمووی : (وە ئامادە دەكەن و دەخۆن) .

گوتی : بەڵێ .

فەرمووی : (خواردنەوەتان هەیە بیخۆنەوە؟) .

گوتی : بەڵێ .

فەرمووی : (ساردی دەكەنەوە و پاكی دەكەنەوە و ئامادەی دەكەن) .

گوتی : بەڵێ .

فەرمووی : (وە دەیخۆنەوە) .

گوتی : بەڵێ .

فەرمووی : (ئایا سەرەنجام بۆ کوێ دەگەڕێنەوە و دەچن؟) .

گوتی : الله و رسولەکەی دەزانن .

فەرمووی : (سەرەنجام و گەڕانەوەیان وەک دوونیا وایە، هەر یەک لە ئێوە هەڵدەستێ بۆ پشتی ماڵەکەی و دەست دەنێ بە لوتیەوە لەبەر پیسی بۆنەکەی).

**٦٥٢** - هۆنراوەم بۆ منصوری فەقیهـ دەگووت : پێم گووت ئەی ئەو کەسەی سەرسامی بەخۆت و نابێت قسەت بگەڕێتەوە، ئەی ئەو کەسەی چەند زووە هاتویتە دەرەوە بۆچی خۆت بە کەم نازانیت).

**٦٥٣** - علي بن أبي طالب رضي الله عنه دەربارەی ئایەتی : | وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ | (**الذَّارِيَاتِ : ٢١**) دەفەرمووێ : (شوێنی پیسایی و میزە) .

**٦٥٤** - أبو جعفر ی البزاز هۆنراوەی بۆ أبي العتاهيه دەگووت و دەیفەرموو : (بەنی ئادەمم بینی لە نەزانیەوە، مونافەسەی الله دەکات لە خۆ بەگەورە زانیندا، دەیەوێ پێی بڵێن ئەوە کێیە و وایە، ئەو هەر ئەوەیە کە هەیە، ئەگەر هەر خواردنێکی حەز لێبێت بیخوات و هەڵدەستێ بۆ شوێنی پیساییەکەی).

**٦٥٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک ڕۆحی لە لاشەی جیابێتەوە وە بەریء بێت لە سێ شت دەچێتە بەهەشت: خۆ بەگەورە زانین، قەرز، دزی لە غەنیمەت).

**٦٥٦** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی کە لوتبەرز بێت و توووند بێت، وە کەسی بەخیل، وە ئەو کەسەی ڕەوشتی بە ناشرینی گرتووە).

**٦٥٨** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لە ڕۆژی قیامەتدا گەردنی مارێک لەناو ئاگردا دێتە دەرەوە، دوو گوێی هەیە و دەبیستێ، وە دوو چاوی هەیە دەبینێت، وە زمانی هەیە قسە دەکات و دەڵێ : نێردراوم بۆ خواردنی سێ کەس؛ بە هەموو کەسێکی لوتبەرزی عیناد، وە بە هەموو ئەوانەی لەگەڵ الله بانگی ئیلاهێکی تر دەکەن، وە وێنەکێشەکان).

**٦٥٩** - أبی ملیکة الذماري دەربارەی ئایەتی : ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ﴾ (**المُطَفِّفِين** : ١٥)

دەڵێ : منەتکار، لوتبەرزەکان، ئەوەی بە سوێندەکەی ماڵی خەڵکی دەخۆن).

٦٦٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ کەس الله قسەیان لەگەڵ ناکات، وە سەیریان ناکات لە ڕۆژی قیامەت، وە پاکیان ناکاتەوە، وە سزایەکی بە ئێشیان بۆ هەیە: پیرێکی زیناکار، دەسەڵاتدارێکی درۆزن، وە فەقیرێکی لوت بەرز).

٦٦١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر ڕێگاتان کرد بە تەنیا - خۆتان جیاکردەوە - ، وە ڕۆیشتن بە سەرسامی بەخۆتەوە، وە خۆت کەڕ کرد لەوانەی قسە دەکەن، الله ﷻ دەفەرمووێ : سوێند بە خۆم دەخۆم کە کۆمەڵێکتان زاڵ دەکەم بەسەر کۆمەڵێکتان).

٦٦٢ - عكرمة کوڕی خالید المخزومي دەڵێ : گوێم لێبوو لە عبدالله ی کوڕی عمر بەرەو مەدینە دەڕۆیشت و منیش پێی گەیشتم، پێم گووت : ئەی إبن عمر ئێمە لە بەنی مەخزومین و تێماندا هەیە لوتبەرزە، ئایا گوێت لێبووە لە رسول الله ﷺ شتێک لەسەر ئەو بابەتە؟

فەرمووی : گووێم لێبووە لە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەس بە خۆ بەگەورە زانیەوە بڕوات، دەگاتەوە بە الله و لێی توڕەیە).

٦٦٣ - پیاوێک لە گەڕەکی بەنی ثور پێی دەگوترا حملة بن الحارث دەیگووت : (ئەی کوڕەکەم، پێچەوانەی نەفستان بکەن، بە پێچەوانەی سەرکەشی ئەسپ چۆن پێچەوانە دەکرێتەوە بە لغاو کردنی، سوێند بەوەی گیانی منی

بەدەستە، من جلێک لەبەر دەکەم ناگات بە سێ درهەم، هێشتا سەیری خۆم دەکەم ئایا گومڕا نەبوومە و توشی لوتبەرزی نەبوومە).

٦٦٤ - إبن الأحمس دەفەرمووێ : گەیشتم بە ئەبوو ذر گووتم : ئەی ئەبوو ذر ئەم حدیثە کامەیە کە پێم گەیشتوە باست کردووە، ئەویش فەرموی : ئەوە چیە ئێستا لە خەیاڵم نیە ئێستا من درۆ لەسەر رسول الله ﷺ ناکەم، منیش گووتم : ئەی ئەبوو ذرپ پێم گەیشتووە کە تۆ دەڵێی (سێ کەس هەن الله ڕقی لێیانە) .

فەرمووی : بەڵێ وامگوتوە و بیستوومە .

گوتم : کێن ئەو سێ کەسە .

فەرمووی : (بازرگان یان فرۆشیارێک کە سوێند زۆر دەخوات، وە کەسێکی فەقیری لوت بەرز، وە بەخیلێکی منەتکار).

٦٦٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەهەشت و جەهەننەم بوو بە موناقەشەیان، جەهەننەم گوتی : دابین کراوم بە وانەی لوت بەرزن و ئەوانەیان خۆیان لەسەر خەڵك هەڵدەکێشن و زوڵمیان لێدەکەن، وە بەهەشت گوتی: من چی بکەم تەنیا ئەوانەی لاوازن دێنە ناو منەوە، وە کەم ئەندام و غەمبار و بێزارەکانن، الله ﷻ بە بەهەشتی فەرموو : تۆ ڕەحمەتی منیت، بەتۆ ڕەحم دەکەم بە هەر بەندەیەکی خۆم کە بمەوێت، وە بە ئاگری

فەرموو : تۆ سزای منیت، بە تۆ سزای هەر کەسێک دەدەم کە بمەوێت، وە بۆ هەر یەکێک لە ئێوە پڕاو پڕ ئامادە کراون؛ بەڵام ئاگر پڕ نابێت هەتاکو الله ﷻ پێی خۆی نەخاتە ناوی، وە جەهەننەم دەڵێت : بەسە بەسە، ئینجا پڕ دەبێت، وە کۆمەڵێکیان بەر کۆمەڵێکیان دەکەون، ئەمما بەهەشتیش الله زوڵم لە هیچ بەندەیەکی خۆی ناکات).

٦٦٦ - المحرز بن المفضل الرازی دەیفەرموو : (ئەی ئەو کەسەی بە لوت بەرزیەوە دەڕۆیت، ئایا سەیری گۆڕت نەکردووە، هەتا ببینیت و سەیری حاڵی خۆت بکەی، ئایا هێشتا هەر لوت بەرزیت دەمێنێ).

٦٦٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر ئوممەتەکەم بە پۆزێکەوە ڕۆیشت، وە کوڕانی دەسەڵاتدارەکانی ڕۆم و فارس خزمەتیان کردن، الله ﷻ خراپترینەکانیان زاڵ دەکات بەسەر باشەکانیاندا).

٦٦٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لە ڕۆژی قیامەتدا ملێك لەناو ئاگردا دێتە دەرەوە کە زۆر لە قیرِ ڕەشترە، دەڵێت : من نێردراوم بۆ خواردنی؛هەموو کەسێکی لوتبەرزی عیناد، وە بە هەموو ئەوانەی لەگەڵ الله بانگی خوایەکی تر دەکەن - دەیپەرستن - ، وە بۆ کەسێک کە بە ناحەق کەسێکی تری کوشتوە؛ جا بەم شێوەیە لێیان دەئاڵێت) .

عبيدالله دەڵێت : (جا پێیانەوە دەئاڵێت پێش خەڵکی بە ئەندازەی پێنسەد ساڵ).

**٦٦٩** - ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ جارێکیان تەئخیربوو هەرچەندێک الله ویستی، و فەرمووی : (ئێوەم ڕاگرت و هێشتمنەوە، نیشانم درا ئەو سێ کەسەی یەکەمجار دەچنە بەهەشت، وە سێ کەسەی یەکەم جار دەچنە ئاگر، ئەو سێ کەسەی یەکەم جار دەچنە بەهەشت ئەوانەن؛ شەهید، وە بەندەیەك بەندایەتی چاکی بۆ الله کردووە و دڵسۆزی خاوەنەکەی بووە، کەسێک کە لاواز و فەقیرە و حەلاڵ پەیدا دەکات، وە ئەو سێ کەسەی یەکەم جار دەچنە جەهەننەمەوە ئەوانەن؛ دەسەلاتدارێکی زۆردار، وە ئەو کەسەی کە خاوەنی سەروەت و سامانە و حەقی الله نادات، وە فەقیرێکی خراپەکار).

**٦٧٠** - عبدالله ی کوڕی عمر و عبدالله ی کوڕی عەمر بەیەک گەیشتن، وە لەگەڵ هەر یەکێکیان چەند کەسێک لە هاوەڵانی خۆی لەگەڵدا بوو، قسەیان بەیەکەوە کرد بەبێ ئەو هاوەڵانەیان لەگەڵیان بوون، دواتر إبن عمر گەڕایەوە و دەگریا، هاوەڵەکەی پێی گووت : چ شتێک تۆی گریاند؟ ئەو کەسە وا دەڵێت کە گوێی لێبووە لە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی بە قەدەر مسقاڵە زەڕەیەک خۆ بەزلزانی لەدڵیدا هەبێت).

**٦٧١** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (الله ﷻ ڕقی لە پیرێکی زیناکارە، وە فەقیرێکی لوت بەرز، وە بەخیلێکی منەتکار)..



## باب : (٣٧)

# کەڕاهەتی زیان گەیاندن بە خەڵکی



٦٧٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک زەرەر بە موسڵمانێک بگەیەنێت ئەوا الله توشی زەرەری دەکات، وە هەر کەسێک سەختیەك توشی موسڵمانێک بکات الله سەختی دەهێنێتە ڕێگای).

٦٧٣ - (سمرة ی کوڕی جندب رضي الله عنه پارچەیەک لە دار خورمایەکی کەوتبووە نێوان دیوار یان باخی خۆی و ئەنصاریەک، ئەنصاریەکە خاو وخێزانەکەی لای باخەکە بوون، سمرەی کوڕی جندب کە دەهات هەموو جارێک بەم شێوە ئەزیەتی دەدان، وە لەسەریان قوڕس بوو، پیاوەکەش هاتە لای رسول الله ﷺ وە شتەکەی بۆ باس کرد، ئەویش ناردی بەدوای سمرة، داوای لێکرد پێی بفرۆشێت، ئەویش قەبوڵی نەکرد، داوای لێکرد لەوێ بیگوازێتەوە، فەرمووی : (بە دیاری بیدەیە وە بەهەمان شێوەت بۆ هەیە لە بەهەشتدا) ئەمیش ڕەتی کردەوە .

رسول الله ﷺ (تۆ زەرەر گەیەنەریت) .

وە بە ئەنصارپەکەی فەرموو : (برۆ خورماکە ببڕەوە).

**٦٧٤** - بە رسول الله یان گووت ﷺ : فڵانە ئافرەت بەڕۆژوو دەبێت و شەو نوێژ دەکات، وە ئەزیەتی دراوسێکەی دەدات .

فەرمووی : (ئەو لە ئاگردایە) .

گوتیان : فڵانە ئافرەت نوێژە فەرزەکان دەکات، وە هەندێک جار کولێرە دەبەخشێ، و ئەزیەتی دراوسێکانی نادات .

فەرمووی : (ئەو لە بەهەشتدایە).

**٦٧٥** - أم سلمة رضي الله عنها دەفەرمووێ: من لەگەڵ رسول الله بووم ﷺ لە ژێر جێگا، مەڕێکی دراوسێکەمان هاتە ژورەوە، پارچە کولێرەیەکی برد کە لەژێر پەڕۆیەك دامنابوو، منیش ڕامکرد بۆ لای، وە لە نێوان ددانەکانی دەرمهێنا، رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەوە کەمتر نیە لە ئەزیەتدانی دراوسێ).



## باب : (٣٨)

# چی هاتووه دەربارەی ستەم کردن لە خەڵکی وە دەست درێژی کردنە سەریان وە لە زەم کراوی ئەم ڕەوشتە و سزایان لە توڕەیی و تۆڵەی الله ـدا



٦٧٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ کەس دوعایان ڕەت ناکرێتەوە؛ ڕۆژووەوان تا بەربانگ دەکاتەوە، و دەسەڵاتدارێکی دادپەروەر، وە دوعای ستەم لێکراو، الله بەرزی دەکاتەوە بەسەر هەورەکاندا، وە دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە، وە الله پێی دەفەرمووێ : سوێند بە شکۆ و عیزەتی خۆم هەر سەرت دەخەم ئەگەر کاتێکی تریش بێت - ئەگەرئێستاش نەبێت - ).

٦٧٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (دوعای ستەم لێکراو وەڵام دەدرێتەوە و گیرا دەبێت گەر چی خراپەکاریش بێت، خراپەکەی بۆ سەر نەفسی خۆیەتی).

٦٧٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ: (هەر کەسێک ستەمی برایەکی لایە - قەرزە لەسەری - لە ماڵی یاخود نامووسی، یا ئەمرۆ گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات پێش ئەوەی لێی وەربگرنەوە لە ڕۆژێک کە نەدیناری تێدایە نە درهەم، گەر بێتوو کرداری چاکی هەبێت، لێی دەسەنرێتەوە بە ئەندازەی ستەمەکەی کە کردوویەتی، وە ئەگەرنا خراپەکانی ئەم کەسە هەڵدەگیرێت و دەخرێتە سەر حسابی ئەو کەسەی ستەمەکەی کردووە).

٦٨٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (خۆتان بپارێزن لە ستەم، چونکە بەڕاستی ستەم تاریکایی قیامەتە).

٦٨٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ: (ئامان وریابن لە ستەم کردن، چونکە بەڕاستی ستەم تاریکایی قیامەتە).

٦٨٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لە الله بترسن، وە ئامان وریابن لە ستەم کردن، چونکە بەڕاستی ستەم تاریکایی قیامەتە).

٦٨٤ - سعيد کوڕی معبد دەفەرمووێ : (أسماء کچی عميس بۆی باسکردم کە جعفر هاتە لایان کاتێک لە وڵاتی حەبەشە بوون، وە دەگریا، من پێم گووت : چیتە بۆچی دەگری؟

فەرمووی : گەنجێکی لاشە گەورە و دەوڵەمەند و بێنیازم بینی لە وڵاتی حەبەشە، بەلای ئافرەتێکدا ڕۆیشت کە تەشتێک ئاردی پێبوو، ئەم گەنجەش شاپێکی لێدا و ئاردەکەی با بردی .

ئافرەتەکە گووتی : دەتدەمە دەستی الملك بۆ ئەو ڕۆژەی لەسەر کورسی دادەنیشێ، وە تۆڵەی ستەم لێکراو وەردەگرێتەوە لە ستەم کار).

٦٨٥ - منصور کوڕی معتمر دەفەرمووێ : (پرسیارمان کرد لە ئیبراهیمی نخعی رحمه الله دەربارەی حجاجی یوسفی الثقفي، ئەویش فەرمووی : ئایا الله نافەرمووێ : ﴿ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (هُودٍ : ١٨) .

٦٨٦ - میمونی کوڕی مهران دەربارەی کەلامی الله ﷻ کە دەفەرمووێ : ﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعۡمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَۚ ﴾ (إِبرَاهِيمَ: ٤٢)

دەفەرمووێ : (ئەو ئایەتە دڵنەواییە بۆ ستەم لێکراو، وە هەڕەشەیە بۆ ستەم کار).

٦٨٧ - میمونی کوڕی مهران دەفەرمووێ : (ستەمکار، ئەو کەسەشی یارمەتی دەدات لە ستەمەکەی، وە ئەو کەسەی خۆشی دەوێت هەموویان یەکسانن).

**٦٨٨** - سعیدی کوڕی موسەیەب دەفەرمووێ : (سلیمانی کوڕی داود علیهما السلام سێ ڕۆژ خۆی زیندانی کرد، نەدەچوە دەرەوە بۆ لای خەڵک، الله وەحی بۆ نارد و پێی فەرموو تۆ سێ ڕۆژە ناچیتە دەرەوە بۆ لای خەڵک، تاکو حەقی ستەم لێکراو وەربگریتەوە لەو کەسەی ستەمی کردووە. ئینجا الله سزای دا، سەروەت و سامانەکەی لە دەست دا).

**٦٨٩** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک بە باطڵێک ڕێگری لە حەقێک بکات، ئەوە لە پاراستنی الله و رسولەکەی نەماوە و لێی بەرین).

**٦٩٠** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (خۆتان بپارێزن لە دوعای ستەم لێکراو، چونکە دوعای ستەم لێکراو هەڵدەگیرێت تا سەر هەورەکان، الله تعالى دەفەرمووێ : بە عیزەت و شکۆ و بەرزی خۆم سوێند بێت، سەرت دەخەم گەر چی ئێستاش نەبێت).

**٦٩١** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ دوعا هەیە وەڵام دراوە و وەرگیراون هیچ گومانی تێدانیە؛ دوعای گەشتیار، دوعای دایک و باوک، دوعای ستەم لێکراو).

**٦٩٢** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (خۆتان بپارێزن لە ستەمەکان هەرچەندێک دەتوانن، بەڕاستی پیاو دێت لە ڕۆژی قیامەتدا بە کۆمەڵانێک

چاكه وایدەبینێت كه ئەم چاكانه ڕزگای دەكەن، هەر بەردەوام لەسەر ئەوە دەبێت، دەڵێن : بەڕاستی فلان كەس ستەمێكی لەلام ماوە: پێی دەگوترێ : له چاكەكانی بسڕنەوە، تا هیچ چاكەیەكی نامێنێتەوە، وە نمونەی ئەوەش وەك كۆمەڵێك وایە كه بچن بۆ سەفەر و له شوێنێك ڕابگرن بۆ ئیسراحەت، هیچ دارێكیان لا نەبێت، كۆمەڵەكە جیا دەبنەوە بۆ ئەوەی دار بهێنن و ئاگر بكەنەوە، ئینجا ئەوەندەیان پێویستیان بێت كۆی دەكەنەوە، ئەمەش نموونەی تاوانە).

**٦٩٣** - عبدالله كوڕی محمد كوڕی عقيل دەفەرمووێ كه جابری كوڕی عبدالله ی أنصاري رضي الله عنهما بۆی باسكردووە و فەرموویەتی : (پێم گەیشت كه له یەكێك له هاوەڵانی رسول الله ﷺ، شتێكی له رسول الله ﷺ بیستوە كه من نەمبیستبوو، وشترەكەمم ئامادە كرد، وە تۆێشووم بۆ سەفەرەكەم ئامادە كرد، یەك مانگە ڕێگام بڕی، تاكو گەیشتمە شام، بینیم ئەو هاوەڵە عبدالله ی كوڕی ئونەیسی ئەنصاری بوو رضي الله عنه، یەكێكم نارد كه بڵێ جابر وا لەبەر دەرگایە .

فەرمووی : نێردراوەكە چوو بۆ لای و ئەویش خۆی هاتە دەرەوە و باوەشی پێداكردم و منیش باوەشم لێیدا .

پێم گووت : بۆ فەرموودەیەک هاتوم کە بیستووتە لە رسول الله ﷺ لەسەر ستەم، وە منیش گوێم لێی نەبووە، منیش ترسام لەوەی بمرم یان تۆ بمریت و پێش ئەوەی گوێم لێی بێت .

فەرمووی : گوێم لێبوە لە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (بەندەکان حەشر دەکرێن - یان گوتی خەڵکی حەشر دەکرێن -، بە ڕووتی و بێ جل و بەرگ و پێڵاو و هیچیان پێنیە، ئینجا دەفەرمووێ : بانگ دەکرێن بە دەنگێک ئەوەی دووره وەك ئەو کەسە دەبیستێ کە نزیکە - واتا هەموو کەس گوێی لێیە - دەڵێت : من الملك م، من پاداشت و سزا دەرم، هیچ کەس لە ئەهلی ئاگر نابێت بچێتە ناو ئاگر، لە کاتێکدا یەکێک لە ئەهلی بەهەشت داوای حەق و زوڵمی خۆی لێبکات، وە نابێت هیچ کەسێک لە ئەهلی بەهەشت بچێت بۆ بەهەشت و حەق و مافی لای ئەهلی ئاگر مابێت هەتا گەر بێتو زلەیەکیش بێت) .

ئێمەش گوتمان : ئەوە چۆن دەبێت ئەی رسول الله لە کاتێکدا ئێمە هیچمان پێنیە و ڕووت و بێ پۆشتەینە .

فەرمووی : (بە کردارە چاکەکان و خراپەکان).

٦٩٤ - ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه دەفەرمووێ : ڕۆژێکیان رسول الله ﷺ دانیشتبوو، پێکەنی تا خرێکانی دەرکەوت، ئیمامی عمر فەرمووی : بە دایک و باوکمە بەقووربانت بم، چ شتێک وای لێکردیت پێبکەنیت .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (دوو پیاو لە ئوممەتەکەم لەسەر چۆك کەوتوون لەبەردەم الله ﷻ، یەکێکیان دەڵێت : یا رب تۆڵەی ئەو ستەمەی لێم کراوە بۆم وەرگرەوە لەم کەسە، الله ﷻ پێی دەفەرمووێ : مافی برایەکەت بۆی بگەڕێنەوە، ئەویش دەڵێت : یا رب هیچ شتێک نەماوەتەوە لە چاکەکانم، ئەوەی تر دەڵێ : یا رب خراپە و تاوانەکانی منی بخە سەر) .

ئینجا رسول الله ﷺ فرمێسکی گریان لە چاوەکانی هاتە خوارەوە، ئینجا فەرمووی : (بەڕاستی ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر گەورەیە، ڕۆژێکە خەڵک پێویستی بەوەیە خەڵکی لە تاوانەکانیان هەڵبگرن).

**٦٩٥** - میمونة رضي الله عنها خێزانی رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ هیچ کاتێک لە ماڵەکەی من دەرنەچوە ئیلا چاوەکانی بەرز کردۆتەوە بۆ ئاسمان و دواتر فەرموویەتی : (اللهم من پەنا بەتۆ دەگرم لەم ڕۆژەدا لەوەی کە پێم بخزێت، یان لەوەی خەڵکی گومڕا بکەم، یان نەزانی و نەفامی بکەم، یان نەزانی و نەفامیم بەرامبەر بکرێت، یان ستەم بکەم یاخود ستەمم لێبکرێت).

**٦٩٦** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ کە الله ﷻ فەرموویەتی : (من ستەم لەسەر خۆم حەڕام کردووە، وە لە نێوان ئێوەش حەڕامم کردووە ستەم لە یەکتر مەکەن، ئەی بەندەکانم ئێوە بە شەو و بە ڕۆژ تاوان دەکەن، وە

من ئەو زاتەم لە تاوانەكان خۆش دەبم و باكم بە هيچ نيە، داواى لێخۆشبوونم لێبكەن لێتان خۆش دەبم).

**٦٩٧** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (باوەڕدارەكان لە ڕۆژى قيامەتدا لە ئاگر تێدەپەڕن، لە سەر پردێكى بچووك ڕادەگيرێن لە نێوان بەهەشت و ئاگر، ئەو ستەمانەى لە دوونيا كردبوويان لە بەرامبەر يەكترى دانە لێيان وەردەگيرێتەوە، هەتاكو ئەگەر كاتێك دەرۆن و پاك دەبنەوە، ڕێگايان پێدەدرێت بۆ چون بۆ بەهەشت، سوێند بەوەى گيانى منى بەدەستە، هەر يەكێك دەچێت بۆ ئەو ماڵەى هەيبوو وەك دوونيا دەيناسێتەوە، وەك ئەوەى بڵێى كە لە ئەهلى جومعەدا دێنەوە بۆ ماڵەكەيان لە دواى كۆبوونەوە و جومعەكەيان).

**٦٩٨** - على رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ پێى فەرمووم : (ئەى عەلى، خۆت بپارێزە لە دوعاى ستەم لێكراو، ئەو داوا لە الله دەكاتەوە، وە بەڕاستى الله حەقى كەس لەسەر كەس نافەوتێنێ).

**٦٩٩** - ئەبوو ذر رضي الله عنه دەفەرمووێ : لە رسول الله وە ﷺ دەفەرمووێ : (الله ﷻ فەرموويەتى : من ستەمم حەڕام كردووە لەسەر بەندەكانم، ئاگاداربن ستەم لە يەكترى مەكەن، وە هەموو بەنى ئادەم

هەڵە دەکات بە شەو و بەڕۆژ، دواتر داوای لێخۆشبوونم لێدەکەن، منیش لێیان خۆش دەبم، وە باکم بە هیچ نیە).

٧٠٠ - ئیبراهیمی نخعی دەفەرمووێ : (ئەوان گەر ستەمێکیان بینیبوایە لە شارەکەیان ئەوا دەڕۆیشتن بۆ شارێکی تر) .

٧٠١ - طلحة ی کوڕی عمرو دەربارەی ئایەتی : ﴿ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذَنُوبًا مِّثْلَ ذَنُوبِ أَصْحَٰبِهِمْ فَلَا يَسْتَعْجِلُونِ ﴾ (الذَّارِيَاتِ : ٥٩) .

دەفەرمووێ : (سزا دەدرێن بە هەمان شێوەی سزادانی هاوەڵەکان و هاوپیشەکانیان).

٧٠٢ - ئەبوو هرەیرە رضي الله عنه دەیفەرموو : (تاوان هەیە لێخۆشبوونی بۆهەیە، و تاوان هەیە لێخۆشبونی نیە، وە تاوان هەیە تۆڵەی دەکاتەوە، ئەمما ئەوەی لێخۆشبوونی بۆنیە هاوبەش بڕیاردانە بۆ الله ﷻ، وە ئەوەیشی لێت خۆش دەبێت ستەم کردنی خۆتە لە نەفسی خۆت، وە ئەوەی کە تۆڵە و پاداشتی لێوەردەگری ستەم کردنتە لە براکەت).

٧٠٣ - أبي زبير دەفەرمووێ : (لە پیاوێکەوە لە ئەهلی مەککەوە کە ئیمامی عمری بینی، دەهاتە دەرەوە لەو دەرگایەی بۆ الصفا دەڕوات، کچێکی

کۆیله هەستا بۆلای هات، وە گوتی : ئەی ئەمیری باوەڕداران، من پەنا بەتۆ دەگرم لە ستەم.

ئەویش فەرمووی : (چیت بەسەرهاتووە)

وتی : گەورەکەم سزای دام لە سەر پشکۆیەک ئاگری دانام، هەتاکو شوێنی دانیشتنم سوتا .

ناردی بەدوای گەورەکەیدا، پێی فەرموو : ئایا نەتدەتوانی بە شتێکی تر سزای بدەیت جگە لە سزای الله؟ ئەگەر تۆڵەوەرگرتنەوە بکرابوایەوە لە گەورە لەسەر کۆیلەکەی ئەوا وامدەکرد، ئینجا **١٠٠** دانە قامچی لێیدا، وە بە کۆیلەکەی ئازاد کرد).

**٧٠٤** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (دوو چین لە ئوممەتەکەم هەن شەفاعەتی من نایانگرێتەوە، یان شەفاعەتیان بۆ ناکەم : دەسەڵاتدارێکی تورەیی ئەوپەڕی ستەمکار و نا دادپەروەر، وە هەموو دەوڵەمەندێکی دەرچوو **- و اتا زیادەڕەو -** ).

**٧٠٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (**ئەوە بەسە بۆت کە ببیە ستەم کار بەوەی بەردەوام لە موناقەشە و بەر بەرەکانێدای**).

٧٠٦ - له جرير ەوه رضي الله عنه دەربارەی کەلامی الله ﷻ کە دەفەرمووێ : | وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ | (هُود: ١١٧) دەفەرمووێ : خەڵکەکەی لەگەڵ یەکتری دادپەوەرن).

٧٠٧ - لە ئەبو هورەیرە وە رضي الله عنه رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (پەلە بکەن لە جەنازەکانتان، ئەگەر چاکەکار بێت پەلەتان کردوە بۆ خێر و بەرێکردنی بۆ خەیر، وە ئەگەر ستەم کاربێت ئەوا ئیسراحەت دەکەن لەبەری، وە لەکۆڵ شانی خۆتانی دەکەنەوە).

٧٠٨ - ابن کنانة کوڕی عباس کوڕی مرداس لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە دەفەرمووێ : کە رسول الله ﷺ ئێوارەی ڕۆژی عەرەفە دوعای بۆ ئوممەتەکەی کرد کە الله لێیان خۆش بێت، زۆر پاڕایەوە، الله ﷻ وەڵامی دایەوە و فەرمووی : (من ئەوەم کردوە - واتا لێیان خۆش بووم - ، ئیلا ستەمەکانیان نەبێت لە یەکتری، ئەوە بەدڵنیاییەوە هەر دەبێت تۆڵە بکرێتەوە لە ستەم کار).

٧١٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر بینیت ئوممەتەکەم بە ستەم کاریان نەگووت : ئەی ستەم کار ئەوا دەستیان لێ بشۆ).

٧١١ - عبدالملك بن قريب الأصمعي دەفەرمووێ : (گوێم لە دەشتەکیەک بوو وە باسی ستەمی یەکێک لە ئەمیرەکان و کاربەدەستەکانی دەکرد و دەیگووت : واللەهـ ئەگەر بێتو دەسەڵات و شکۆ بە دەست بهێنن لە دوونیا بەهۆی ستەم کردنەوە، ئەوا لە قیامەتدا زەلیل دەبن بە دادپەوەری اللّٰه، وە کەمێکە و هەر دەبڕێتەوە بەڵام زۆرێکی نەبڕاوەیان بۆ دانراوە، وە ئەو ڕۆژە هیچ شتێکی بە دەست نامێنێتەوە جگە لە پەشیمانی).

٧١٢ - عبداللّٰهی کوڕی عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (دەسەڵاتدارێک لە دەسەڵاتدارەکان چوە دەرەوە و دەگەڕا بەسەر وڵات و دێهاتەکەیدا، وە خەڵکی بە سوک و کەم دەزانی، دابەزی لەلای پیاوێک کە مانگایەکی هەبوو، چوو بۆ لای مانگاکە و دەستی کرد بە دۆشینی، شیرەکەی بە ئەندازەی سی مانگا دەبوو.

دەفەرمووێ : ئینجا بەیانی دیسان هەڵسایەوە و چوو بۆلای، مانگاکەی نارد بۆ لەوەڕگا، ئینجا چوو بۆ ئەوەی بیدۆشێت، بینی شیرەکەی بە نیو هێندە کەمی کردووە، شیرەکەی بوو بە هی هێندەی پانزە مانگا.

ئینجا دەسەڵاتدارەکە بانگی بەخێوکەرەکەی کرد، وە پێی گووت : ئایا لەوەڕگات گۆڕیوە بۆ شوێنێک جیا لەوەی دوێنێ؟، یان خواردنەوەی گۆڕاوە لەگەڵ خواردنەوەی دوێنێ؟

ئەویش گووتی : لەوەڕی نەخواردوە لە جیا لە هی لەوەڕگاکەی دوێنێ، وە هیچ خواردنەوەیەکی نەخواردوە جیابێت لەو شوێنەی دوێنێ لێی خواردوە **- واتا هەربردوومە هەمان شوێن -** .

گوتی : ئەی لەبەر چی شیرەکەی کەمی کردووە؟

کابرا گووتی : پێدەچێت دەسەڵاتداری وڵات ویستبێتێ کە بیبات بۆخۆی .

دەسەڵاتدارەکە پێی گووت : تۆ لە کوێ دەسەڵاتدار دەناسیت؟

ئەویش پێی گووت : هەر بەو شێوەیەیە کە پێت دەڵێم، ئەگەر دەسەڵاتدار ستەمی کرد، یان ویستی کە ستەمێک بکات، ئەوا بەرەکەت نامێنێت، یان بەرەکەت بەرز دەبێتەوە.

دەفەرمووێ : ئینجا دەسەڵاتدارەکە لە نەفسی خۆی پەیمانی دا کە مانگاکە نەبات، وە هیچ کات نەیکاتە موڵکی خۆی.

دەڵێ : ئینجا بەیانی هەڵسا دیسان چوو بۆ لای و چاودێری کرد، بینی مانگاکەی نارد بۆ لەوەڕگاکە، ئینجا چوو بیدۆشێت، بینی شیرەکەی گەڕابوویەوە بۆ هەمان ئەندازەی پێشووتر.

دەڵێ : بانگی خاوەنەکەی کرد، پێی گووت : ئایا مانگاکەت لەوەڕاندوە لە شوێنێکی جیا لە شوێنی دوێنێ؟ وە ئایا خواردنەوەی خواردوە بە شوێنێکی تر جیا لە هی دوێنێ؟

گووتی : نا، لەوەڕم پێی نەداوە ئیلا لە هەمان جێگای دوێنێ نەبێت، وە خواردنەوەم پێی نەداوە ئیلا لە هەمان شوێنی دوێنێ نەبێت.

دەسەڵاتدارەکە گووتی : هۆکار چیە و بۆچی شیرەکەی وەک خۆی زیادی کردۆتەوە؟

گووتی : پێدەچێت لەوانەیە کە دەسەڵاتداری وڵات ویستوویەتی دادپەروەر بێت .

دەفەرمووێ : ئینجا دەسەڵاتدارەکە بەمە پەندی وەرگرت .

وە گووتی : ستەم ناکەم، وە دەبێت دادپەروەر ببم، وە دەبێت ببم بە کەسێک باشتر لەو کەسەی هەبووم).

---

**: لەسەرئەم باسە هیچ ناڵێم تەنیا چوارئایەت دادەنێم خۆتان لێی ورد ببنەوە :**

﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾ (هُود: ١١٣) .

﴿ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴾ (طه : ١١١) .

﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾

**وە بزانن ستەم کردن ڕێگریە لەوەی هیدایەت وەربگریت.**

﴿ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴾ (الحَجّ: ٧١) .

## باب : (٣٩)

## چی هاتووە دەربارەی فەزڵی سەرخستنی ستەم لێکراو، وە چی هاتووە دەربارەی تاوانی دانیشتن و بێدەنگ بوون لە سەرخستنی



**٧١٣** - براء کوڕی عازب رضي الله عنه دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ فەرمانی پێدەکردین بە سەرخستنی ستەم لێکراو).

**٧١٥** - لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرمووی : (براکەت سەر بخە گەر ستەم کار بێت یان ستەم لێکراو) .

گوتیان : ئەی رسول الله ﷺ سەری دەخەین گەر ستەم لێکراو بوو بەڵام ئەی گەر ستەم کار بێت چۆن؟

فەرمووی : (ڕێگری لێ بکە لەوەی ستەم بکات ئەوە سەرخستنی تۆیە بۆی).

٧١٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (پیاو دەبێت براكەی سەر بخات گەر ستەم كار بێت یان ستەم لێكراو، ئەگەر ستەم كار بوو قەدەغەی لێبكە لە ستەمەكەی، وە ئەگەر ستەم لێكراو بوو ئەوا سەری دەخات).

٧١٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (پەروەردگاری تۆ دەفەرمووێ : سوێند بە شكۆ و بەرێزی خۆم تۆڵە ستەم كار دەستێنمەوە بە پەلە بێت، یان لەسەرخۆیی و لە دوایی، وە تۆڵە لەو كەسەش دەكەمەوە كە ستەم لێكراوێكی بینیووە كە ستەمی لێدەكرێت وە توانیویەتی سەری بخات بەڵام واینەكردووە).

٧١٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (موسڵمان برای موسڵمانە، ستەمی لێناكات وە ڕادەستیشی ناكات).

---

: سەبارەت بە نصرقی مظلوم ئەوا لای هەمووتان شتێكی ئاشكرايە كە سەرخستنی ستەم لێكراو ڕەوشتێكی جوانە و شتێكی چاك و ئەمر پێكراوە، بەڵام نوسەر كە لێرەدا هێناویەتی مانای ئەوەیە تەنیا بە دەست هەڵگرتنت لەم ڕەوشتە ئەوا شتێكی ناشرینت ئەنجام داوە، دەبێ بە ئەندازەی توانای خۆت ستەم لێكراو سەر بخەیت، بەڵام ستەم لێكراوی موسڵمان ئەمرت پێكراوە سەری بخەی چونكە ﷺ دەفەرمووێ : (براكەت سەر بخە، كەواتە جگە لە ئافرەت و پیاوی موسڵمان كافر و باقی تر برات نین) .

رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (أوثق عرى الإيمان : الموالاة في الله والمعاداة في الله والحب في الله والبغض في الله عزوجل).

**رواه الطبراني**

واتا : (توندترین پەتی ئیمان بریتیە لە : دۆستایەتی كردن لە پێناو الله و دژایەتی كردن لە پێناو الله و خۆشەویستی لە پێناو الله و ڕق لێبوونەوە لە پێناو الله) .

وە ﷺ دەفەرمووێ : (مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ لِلَّهِ وَأَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ).

**رواه أبي داود**

واتا : (هەركەسێك خۆشەویستی لە پێناو الله بێت، وە ڕق لێبونەوەی لەبەر الله بێ و لەبەر الله ڕێگری بكات و لەبەر الله ببەخشێت ئەوا ئیمانی تەواوە) .

وە ئەوە بابەتێك نیە كە بتوانین خۆمانی لێ بدزینەوە چونكە رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (مَا مِنِ امْرِئٍ يَخْذُلُ امْرَأً مُسْلِمًا فِي مَوْضِعٍ تُنْتَهَكُ فِيهِ حُرْمَتُهُ وَيُنْتَقَصُ فِيهِ مِنْ عِرْضِهِ إِلاَّ خَذَلَهُ اللَّهُ فِي مَوْطِنٍ يُحِبُّ فِيهِ نُصْرَتَهُ وَمَا مِنِ امْرِئٍ يَنْصُرُ مُسْلِمًا فِي مَوْضِعٍ يُنْتَقَصُ فِيهِ مِنْ عِرْضِهِ وَيُنْتَهَكُ فِيهِ مِنْ حُرْمَتِهِ إِلاَّ نَصَرَهُ اللَّهُ فِي مَوْطِنٍ يُحِبُّ نُصْرَتَهُ) .

**رواه أبي داود**

واتا : (هیچ پیاوێكی موسڵمان نیە كە پشتی موسڵمانێك بەربدات لەو شوێنەی كە سوكایەتی بە براكەی دەكرێت وە حورمەتی هەتك دەكرێت - واتا باسی محرەمەكانی دەكرێ - ، ئیلا الله لەو شوێن و جێگایە وازی لێدەهێنێت و وێڵی دەكات كە خۆی پێی خۆشە تێیدا سەربكەوێت، وە هیچ پیاوێكی موسڵمان نیە كە براكەی سەربخات لە شوێنێكدا كە سوكایەتی پێ دەكرێت یان هەتكی ناموسی دەكرێت، ئیلا الله سەری دەخات لەو شوێنەی كە پێی خۆشە سەربكەوێت) .

وه ﷺ دەفەرمووێ : (مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى).

**رواه الشيخان**

رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (نموونەی ئیمانداران بەیەكەوە لە خۆشەویستی و سۆزداری وڕەحم یان بۆیەكتروەك یەك جەستە وان، ئەگەربەشێك لە جەستەی توشی ئازاربێ ئەوا هەموو جەستەكە هەست بە ئازاروتا دەكات) .

و قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : (الْمُسْلِمُونَ كَرَجُلٍ وَاحِدٍ إِنِ اشْتَكَى عَيْنُهُ اشْتَكَى كُلُّهُ وَإِنِ اشْتَكَى رَأْسُهُ اشْتَكَى كُلُّهُ).

**رواه مسلم**

لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرمووێ ﷺ : (موسڵمانان وەك كەسێك وان كە ئەگەر چاوێكی ئازاری هەبێ هەموو جەستەی ژان دەیگرێ وە گەرسەری بهێشێ هەموو جەستەی ژان دەكات) .



## باب : (٤٠)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی تاوانی دزینی زەوی بە ستەم



٧١٩ - محمد کوڕی ئیبراهیم دەگێڕێتەوە : کە أبا سلمة رضي الله عنه بۆی گێڕایەوە کە لە نێوان ئەو و کۆمەڵە خەڵکێک دەمە دەمێ دروست بوو لەسەر زەوی، وە ئەویش چوە لای خاتوو عائیشە رضي الله عنها، بابەتەکەی بۆ باس کرد، ئەویش پێی فەرموو : ئەی أبا سلمة، دوور بکەوە لە بابەتی زەوی، رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەسێک بستێك لە زەوی داگیر بکات ئەوا قلْپی دەکاتەوە تا زەوی حەوتەم).

٧٢٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک بستێك لە زەوی داگیر بکات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا قلْپی دەکاتەوە تا زەوی حەوتەم).

٧٢١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک بستێك لە زەوی داگیر بکات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا قلْپی دەکاتەوە تا زەوی حەوتەم).

٧٢٢ - زوهری و أبوبكر بن حزم دەگێڕنەوە : كە مەڕوان ناردی بە دوای سعید كوڕی زید كوڕی عمرو بن نوفەیل قسەی لەگەڵ كرد لەسەر أروای كچی أویس، وە بەربەرەكانێ بوو لە شتێكدا گوایە كە سعید زوڵمی لێدەكات، سعید فەرمووی : ئێوە وا دەزانن من ستەمی لێدەكەم، لە كاتێكدا من بیستوومە لە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (هەر كەسێك بستێك لە زەوی داگیر بكات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا قلّپی دەكاتەوە تا زەوی حەوتەم)

اللهم ئەگەر درۆ دەكات ئەو ئافرەتە ئەوا مەیمرێنە تاكو چاوەكانی كوێر دەبن، وە بیرەكەی خۆی ببێت بە گۆڕەكەی، دواتر مرد و گۆڕەكەی بیرەكەی خۆی بوو . . .

ابن حزم فەرمووی : ئێمە ئەو كات هەرزەكار بووین و گوێمان لێدەبوو یەكێك بە یەكێكی تری دەگووت : الله كوێرت بكات وەك كە أروا ی كوێر كرد، وا گومانمان نەدەبرد كە ئەوە نەبێت كە ئەم پەند و قسەیە ئیلا لەوە بوو كە اروای كچی أویس چی بەسەرهات و دوعای سعید كوڕی زید رضي الله عنه چۆن وەڵام درایەوە).

٧٢٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر كەسێك بستێك لە زەوی داگیر بكات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا قلّپی دەكاتەوە تا زەوی حەوتەم).

٧٢٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک بستێك لە زەوی داگیر بکات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا قڵپی دەکاتەوە تا زەوی حەوتەم، وە هەر کەسێک بکوژرێت لەسەر ماڵەکەی ئەوا شەهیدە).

٧٢٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک بستێك لە زەوی داگیر بکات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا قڵپی دەکاتەوە و لێی دەئاڵێ تا زەوی حەوتەم).

٧٢٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر پیاوێک بستێک لە زەوی بە ستەم داگیر بکات ئەوا پێی دەگوترێ کە چاڵ هەڵبکەنێ تا دەگات بە زەوی حەوتەم، ئینجا لێی دەئاڵێ لە ڕۆژی قیامەتدا هەتاکو دادگایی دەکرێت لەناو خەڵکیدا).

٧٢٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک شتێک لە زەوی داگیر بکات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا قڵپی دەکاتەوە تا زەوی حەوتەم).

٧٣١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لەعنەتی الله لەو کەسەی نەخشەی زەوی دەگۆڕێت).

٧٣٢ - پیاوێک هات بۆ لای ئیمامی علی رضي الله عنه وە پێی گووت : ئەی ئەمیری باوەڕداران، هەواڵم پێ بدە چ شتێک هەیە رسول الله ﷺ بە نهێنی بە تۆی فەرموبێت .

ئەویش توڕەبوو، وە فەرمووی : هیچ کات رسول الله ﷺ شتێکی بە نهێنی بۆ من باسنەکردووە کە لە خەڵکی شاردبێتەوە، جگە لەوەی چەند شتێکی پێ فەرمووم کەم کەس بیستویەتی .

کابراش گووتی : ئەوانە چین ئەی ئەمیری باوەڕداران؟

فەرمووی : (لەعنەتی الله لەو کەسەی نەخشەی زەوی دەگۆڕێت).

٧٣٣ - لە أبي قلابة وە : کە پیاوێک لە موهاجرین چوە لای پیاوێک لە أنصاریەکان، ئەو أنصاریە ش جێگای بۆ کردەوە لە ماڵەکەیدا، دواتر منداڵەکانی أنصاریەکە گەورە بوون، پێویستی بەوە بوو بچێتەوە ئەو ماڵەی خۆی - واتا خانووی خۆی کردبوو بە دوو بەش - ، کابرای موهاجیریش نکۆڵی و ئینکاری کرد کە بیداتەوە، بەربەرەکانێ و مناقەشەیان برد بۆ لای رسول الله ﷺ، أنصاریەکە داوای ڕوون کردنەوەی کرد، موهاجرە کەش سوێندی خوارد کە هی خۆیەتی، أنصاریەکەش سوێندی خوارد، ئەو کاتەی أنصاریەکە گەیشتەوە ماڵەوە .

فەرمووی : بەڕاستی فڵان کەس بە هیلاک چوو، وە ڕازی بوو بەو شتە، وە منیش ڕازی بووم بەوەی لە الله وە دەمەوێت، وە ئەویش پەشیمان دەبێتەوە بەم نزیکانە، ئەگەر هاتەوە و وپێشکەشی کردنەوە ئەوا لێی وەرمەگرنەوە، کاتێك أنصاریەکە مرد کابرای تر پەشیمان بوویەوە، هاتە لای منداڵەکانی أنصاریەکە ئەوانیش لێیان وەرنەگرت، چوو بۆ لای رسول الله ﷺ ئەویش ناردی بە دوای

کوڕەکانی انصاریەکە، کوڕەکانی أنصاریەکەش ئەوەیان پێ گووت کە باوکیان پێی گوتبوون، ئەویش هیچی نەفەرموو .

کابرا گووتی : چیم پێ دەڵێی فەرمانت چیە ئەی رسول اللّٰە .

فەرمووی : (لەعنەتی اللّٰە لەو کەسەی لەعنەت لە دایك و باوکی دەکات، لەعنەتی اللّٰە لەو کەسەی ئاژەڵێک سەر دەبڕێت بۆ جگە لە اللّٰە، وە لەعنەتی اللّٰە لەو کەسەی داڵدەی تاوانبارێک دەدات، وە لەعنەتی اللّٰە لەو کەسەی نەخشەی زەوی دەگۆڕێت، ئایا دەتوانیت لە خوار حەوت چینی زەوی هەڵی بگریت - بەرگەی ئەوە دەگریت - ؟).



## باب : (٤١)

## چی هاتووه دەربارەی ئەوەی یەکێک یارمەتی ستەم کارێک بدات لە نەدانی حەقێک بە برایەکی موسڵمانی خۆی



٧٣٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک تکایەک بکات؛ لە یەکێک لە سنورەکانی الله بۆ ئەوەی یەکسانی بکات یان لای بدات لەسەری ئەوا دژایەتی الله ی کردووە لە موڵکەکەی، وە هەر کەسێک لەگەڵ کۆمەڵێک بڕوات خەڵک وابزانێت کە ئەو شاهێدە و لەو شتە ئامادەبووە، بەڵام شایەت نیە، ئەوە شایەتی خراپە و درۆیە، وە هەر یەکێک یارمەتی بەربەرەکانێ و مناقەشەیەك بدات کە نازانێت حەقە یان باطل ئەوە لەژێر تورەیی الله ﷻ دایە).

٧٣٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەرکەسێک بە باطڵێک ڕێگری لە حەقێک بکات، ئەوا لە پاراستنی الله و رسولەکەی نەماوە و لێی بەرین).

---

: بۆیە ئەم بابەتە پێمان دەڵێت کە نابێت ببینە تکا کاربۆ تاوانێك و مونکەرێک، کەسێک دەبینی خراپەیەك دەکات دزیەك دەکات درۆیەك دەکات مەڵێ لەبەر من لێی خۆش بە و لەبەرمن لێی ببوورە تاکو حەدی خۆی لەسەرجێ بەجێ بکرێت لایەنی کەم کە ئەمڕۆ یاسای الله جێ بەجێ ناکرێت بهێڵە با ئەم خۆی بە دووربگرێت لەو دزە لەو درۆزنە لەو فاجرو فاسقە مەبە پەرژین لەو ناوەندە، بابێکی زۆرکورتە لەم کتێبە بەڵام بەڕاستی ئەمڕۆ هی ئەوەیە زۆرلێی ورد بین ناکرێ تۆی موسڵمان لەبەرئەوەی خەڵک ڕێزت لێدەگرێت ببیە پەرژین بۆناحەق بەڵکولەسەرت واجبە پشتی حەقەکە بگریت گەرچی دووریش بێت لێت گەرچی بێ دەسەڵاتیش بێت، خۆگەرپشتی حەقەکە نەگریت و بێدەنگ بیت هێشتا ئاسانترە لەوەی پشتی ناحەقەکە بگریت و سەری بخەی .

ئەوە لە حاڵێکدایە کە شتەکە کوفر نەبێت بەڵام گەرهاتە سەرباسی کوفرو ئیمان ئەوا بە حاڵ لایەنی کوفر بگری لەگەڵ ئەو حسێب دەکرێیت بەبێ خاترگرتن، دینی ئێمە خاترانە و خزمانە نیە .



## باب : (٤٢)

## ئەوەی هاتووە لەسەر کەڕاهەتی ئەوەی مرۆڤ شتێک لە براکەی ببات وەک گاڵتە پێکردن



٧٣٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هیچ یەکێک لە ئێوە شتێک لە براکەی وەرنەگرێت یان نەبات وەک گاڵتە کردن و سوعبەت، وە ئەگەر گۆچانی هاوڕێکەیشی برد با بۆی بگەڕێنێتەوە).

٧٣٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هیچ یەکێک لە ئێوە شتێک لە براکەی وەرنەگرێت یان نەبات نە بە گاڵتە کردن و نە بەجدی ش، وە: ئەگەر گۆچانی هاوڕێکەیشی برد با بۆی بگەڕێنێتەوە).

٧٣٨ - أبو عبيد قاسم ی کوڕی سەلام دەربارەی ئەو فەرموودەیە دەفەرمووێ : واتای ئەوەیە : (ئەوە یاری پێ کردنێکە داخڵی دزی دەبێت، بەڵام بە حەقیقی دەبێتە هۆی ترساندن و ئەزیەت دانی براکەت - واتا گەردزیش نەبێت لایەنی کەم ئەزیەت دان وترساندنە - ).

**٧٣٩** - عمرو كوڕی يثربی دەفەرمووێ: رسول الله ﷺ وتاری بۆ دەداين و فەرمووی: (حەڵاڵ نیە بۆ پیاو هیچ شتێک لە ماڵی براکەی ئیلا بە ڕازی بوونی خۆی نەبێت).

گوتم: ئەی رسول الله ﷺ ئەگەر تووشی ڕانە مەڕی کوڕی مامێکم بووم، ویستم مەڕێکی سەر ببڕم؟

رسول الله ﷺ فەرمووی: (شتی وا نەکەی ئەگەر بینیت تاکە بزنێکیش خەریکە وێڵ بێت، تەنانەت ئەگەر بێت و لە خبت الجمیش بێت).

حاتم دەفەرمووێ: خبت الجمیش: دەشتێکە لە نێوانی مەککە و مەدینە.



## باب : (٤٣)

## كەڕاهەتی ئەوەی مرۆڤ زۆر بڵێت وا گومان دەبەم - واتا سیقە نەکەی هەر بڵێی پێدەچێت -



٧٤٠ - عبدالله ی کوڕی عامر دەفەرمووێ : ئەی باوکی مسعوود چیت گوێ لێبووە لە رسول الله وە ﷺ دەربارەی ئەوەی بڵێی وا گومان دەبەین، فەرمووی : گوێم لێبووە دەیفەرموو : (ئەو کەسە لە ناخی خۆیدا زۆر پیسە).

٧٤١ - یحيى ی کوڕی هانيء لە باوکیەوە، دەگێڕێتەوە کە بە کوڕەکەی گووت : دوو وشە لەناو قسەکانتدا ئاگاداری بە - لێم وەربگرە - : بەڵێ، دواتر).

---

: واتا گەر ڕاست نەبوو یان گوماناوی بوو بڵێ دواتر یانی لێی بکۆڵەوە یان لێی ورد ببەوە، الله أعلم بالصواب ..



# باب : (٤٤)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی کەڕاهەتی ئەوەی مرۆڤ قسەیەک بکات دواتر بیانووی بۆ بهێنێتەوە



**٧٤٢** - أبو ئەیووبی أنصاری دەفەرمووێ : پیاوێـک هات بۆ لای رسول اللّٰه ﷺ و پێی گووت : ئامۆژگاریم بکە بە پوختی.

ئەویش فەرمووی ﷺ : (ئەگەر نوێژت کرد نوێژێک بکە وەك ماڵئاوایی بێت - واتا وەک ئەوکۆتا نوێژتە - ، وە قسەیەک مەکە کە بەیانی بیانووی بۆ بهێنیتەوە، وە بێ نیاز بە لەوەی لە دەستی خەڵک دایە).

**٧٤٣** - عمری کوڕی خطاب ئامۆژگاری پیاوێکی دەکرد و پێی فەرموو : (قسە لە شتێک دا مەکە پەیوەندی بە تۆوە نیە، وە خۆت لە دووژمنەکەت بە دوور بگرە، وە ئاگاداری هاورێکەت بە جگە لە کەسێک نەبێت کە ئەمانەت پارێزە، ئەمانەت پارێزیش ئەو کەسەیە لە اللّٰه ﷻ دەترسێت).

**٧٤٤** - خالد كورى عبدالرحمن دەفەرمووێ : میمون ی كوڕی مهران هاته لام و منیش خەریكی نوسین بووم، پێی فەرمووم : (زۆر شت مەنووسە، كەمێكن لەئەوانەی زۆر دەنوسن ئیلا درۆ دەكەن، وە كەمن ئەوانەی بیانوو دەهێننەوە ئیلا درۆ دەكەن).

**٧٤٥** - ابن عون دەفەرمووێ : من و شوعەیبی كوڕی حبحاب چووینە لای إبراهیم ی نەخەعی، من یان یەكێك لە ئێمە بیانوویەكمان هێنایەوە، فەرمووی : من بیانووم بۆ هێنایەوە پێویستی بە بیانوو نەبوو، بەڕاستی بیانوو هێنانەوە ڕێگایەكی لە درۆیە - درۆیەك پاڵی پێوە دەنێت - ).

---

**: لە ئەثەرەكەی ئیمامی عمر رضي الله عنه باسەكە ڕوون دەبێتەوە كە ئەگەر مرۆڤ لە شتێكدا قسەی كرد كە پەیوەندی بەوەوە نیە یان بەبێ زانست قسەی كرد گەربلێن بۆوات كرد وو اتگووت ناچارە بیانوو بهێنێتەوە.**



## باب : (٤٥)

## ئەوەی هاتووە لەسەر کەڕاهەتی قەبوڵ نەکردنی عوزر و ڕەتکردنەوەی



٧٤٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک بیانوو بۆ برایەکی بهێنێتەوە و ئەویش بیانووەکەی لێ قەبووڵ نەکات ئەوا تاوانی وەك کەسێک وایە کە باج و سەرانە لە خەڵک وەرگرێت).

٧٤٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هیچ پیاوێک نیە کە بڕوات بۆ لای براکەی، بیانوویەکی بۆ بهێنێتەوە و ئەویش لێی قەبووڵ نەکات، وەک کەسێک وایە کە زەریبە وەربگرێت لە خەڵکی).

٧٤٨ - محمد بن إسماعيل الإسحاقي دەفەرمووێ : (ئەگەر ئەو کەسەی تاوانێکی کرد بیانووی بۆت هێنایەوە ئەوا بیانووەکە تاوانەکەی دەسڕێتەوە، وە ئەو کەسەیشی بیانووەکە قەبووڵ ناکات ئەوا تاوانبارە).

**٧٤٩** - أبو عبدالله المارستاني هۆنراوەی بۆ دەگووتم و فەرمووی : بەڕاستی بیانوو هێنانەوە بەشێکە لە داوای لێبووردن، ئەو کەسەی دانی پێدا دەنێت ئەوا لە دادپەوەری خۆیەتی، وە پێگەی تۆی درك پێکردووە بۆیە زەلیلی دانپێدانانی قەبووڵ کردووە).



## باب : (٤٦)

## کەڕاهەتی ئەوەی پیاو هاوڕێیەتی کەسانی خراپ بکات



٧٥٠ - مالکی کوڕی دینار بە موغەیرەی زاوای خۆی فەرموو : (ئەی موغەیرە، بڕوانە لە هەموو برایەکی خۆت، وە هەموو هاوەڵێکی خۆت، وە هاوڕێکانت، ئەوەی هیچ خێرێکی نیە بۆ قیامەتت، خۆت لە هاوەڵێتی ئەو دوور بخەوە، چونکە ئەوە دووژمنی تۆیە).

وە دەیفەرموو : (ئەی موغەیرە خەڵکی جۆراو جۆرن : کۆتر لەگەڵ کۆتر، قەلە ڕەش لەگەڵ قەلە ڕەش، بولبول لەگەڵ بولبول، هەمووی لەگەڵ جۆری خۆیەتی).

٧٥١ - أوزاعی دەفەرمووێ : بلال کوڕی سعد دەیفەرموو : (برایەکی تۆ ئەگەر هەر جارێک پێت بگات و بیری اللّٰە ت بیر بخاوە ، زۆر باشترە بۆت لە برایەک کە هەر کات پێت گەیشت دینارێک بخاتە مشتت).

٧٥٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (پیاو لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، هەر یەک لە ئێوە سەیر بکات هاوڕێیەتی کێ دەکات).

٧٥٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (پیاو لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، هەر یەک لە ئێوە سەیر بکات هاوڕێیەتی کێ دەکات).

٧٥٤ - کۆمەڵێک لە هاوەڵانمان هۆنراوەیان بۆ دەگووتم : (هەر کەسێک برایەتیت ناکات لە پێناو الله، سەرکەوتوو نابیت گەر بەردەوام بیت لەسەر برایەتی کردنی، باشترینی براکان ئەوەیە لەبەر الله بێت، ئەوا لەو دا سەلامەت و براوە دەبیت).

٧٥٥ - عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه دەفەرمووێ : (ئاگادارت دەکەمەوە بە برایانی ڕاستگۆ، تۆ زیرەک بە لە بەدەست هێنانیان، چونکە ئەوان جوانین لە کاتی خۆشیدا، وە شکۆ و غیرەتن لە کاتی بەڵاکاندا).

٧٥٦ - میمونی کوڕی مهران دەفەرمووێ : (هاوڕێیەتی دوو کەس مەکە، ئەو کەسەی خواردنی حەڕامە، وە بیدعەچی).

٧٥٧ - لوقمانی حەکیم بە کوڕەکەی فەرموو : (ئەو کەسەی دەسەڵاتی بەسەر زمانی دا نەبێت پەشیمان دەبێتەوە، وە هەر کەسێک زۆر موناقەشە بکات جنێو دەدات، وە هەر کەسێک هاوەڵێتی کەسی خراپ

بکات سەلامەت نابێت - **سێ جارو ایگووت** - ، وە هەرکەس هاوەڵی کەسی باش بکات ئەوا دەستکەوتە بۆی).

**٧٥٨** - میمونی کوڕی مهران دەفەرمووێ : (عمری کوڕی عبدالعزیز پێی گوتم : ئەی میمون ئامۆژگاریت دەکەم بەوەی ک لە نێوانتان ئەگەر بێت و قورئانیشی بۆ بخوێنی، وە تێکەڵی ئەو کەسە مەبە کە سیلەی ڕەحمی پچڕاندووە، بەڕاستی اللّه ﷻ لە دوو ئایەتدا لەعنەتی کردووە لەوانەی سیلەی ڕەحم دەپچڕێنن، ئایەتێک لە سورەتی الرعد کە دەفەرمووێ : ﴿ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴾ **(الرَّعد: ٢٥)** .

وە لە سورەتی محمد کە دەفەرمووێ : ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ (٢٢) أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ (٢٣) ﴾

---

**بابەتی هاوڕێیەتی کردنی کەسانی خراپ بە هەموو شێوەیەك حەڕام کراوە، جگە لەوەی کە دەعوەی دەکەی یان دەزانیت ڕێگەی حەق دەگرێت و ئاسانە بانگەوازکردنی، گەرنا کەسانی خراپ دەبێ هەر لێشیان دوور بی نەوەك هاوڕێیەتیان بکەی وەك لە فەرموودەکە هاتووە کە رسول اللّه ﷺ دەفەرمووێ : (نموونەی هاوڕێی خراپ وەك ئاسنگەر وایە گەر زەرەریشت پێ نەگەیەنێت ئەوا پرۆشکت بەر دەکەوێت، وە نموونەی**

هاوڕێی باش وەك بۆن فرۆش و ایە گەرلێشی نەکڕیت یان قازانجت پێ نەگەیەنێت ئەوا بۆنی خۆشت بۆ دێت).

وە الله ﷻ ئەمری بە رسول الله ﷺ و بە ئێمەش کردووە کە دەفەرمووێ : ﴿ وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴾ (الكهف : ٢٨) بڕوانە تەفسیرەکەی..

ئیمامی شافعی دەفەرموێ : (برادەر و هاوەڵ ڕاکێشەرە) و اتا بەرەو خۆیت دەبات ئیلا، وە هەرچەندێک باش بیت هاوڕێیەتی کێ بکەی وەک ئەویت) .

عبداللهی کوڕی مسعود دەفەرمووێ : (خەڵکی پۆلێن بکەن بە دۆستەکانیان، بەڕاستی پیاو دۆستایەتی کەسێک ناکات ئیلا کەسێک نەبێ کە خۆشی دەوێ).

شاعیر دەڵێ : (پرسیار مەکە دەربارەی پیاو بەڵکو بڕوانە کێ دۆستیەتی، هەموو کەسێک بەدوای هاوشانی خۆی دەکەوێت) .

بەڕاستی بابەتێکی زۆرزۆرگرنگە تکایە وریای بن سوێند بە الله گەربمانەوێ تەواو ئەثەر و فەرموودەکان بهێنین ئەوا بە بیست و انە ش تەواو نابێت، بەڵام بزانن دینی ئێمە بە هەموو شێوەیەك ئاگادارت دەکاتەوە لەوەی بزانی کێ هەڵدەبژێریت... کە پێویستە دوور بیت لە کەسانی موشریک، کەسانی مبتدع، ئەهلی هەوا و دوونیا، ئەهلی خواردن و ڕابواردن، ئەهلی گاڵتە و گەپ، ئەهلی کات بەفیڕۆدان. گەرباسیان بکەم خۆتان لە من باشتردەزانن چەندی پێدەچێ!

الله ﷻ دەفەرمووێ : ﴿ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾

ئەوانەی دۆستی یەکتربوون لەم ڕۆژە سەختەدا (ڕۆژی قیامەت) هەندێکیان دەبن بە دووژمنی هەندێکیان ئیلا کەسانی لە الله ترس نەبێت).

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ، وَمُجَاهِدٌ، وَقَتَادَةُ: صَارَتْ كُلُّ خِلَّةٍ عَدَاوَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَّا الْمُتَّقِينَ .



# باب : (٤٧)

## كەڕاهەتی نازناوی ناشرین دانان بۆ یەکتر



**٧٥٩** - لە الشعبي : لە أبي جبيرة بن الضحاك الأسلمي، دەفەرمووێ : (ئەو ئایەتە لەسەر ئێمە دابەزی ئەی کۆمەڵەی أنصار، رسول الله ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، وە پیاوێک دوو ناو سێ ناوی هەبوو، زۆربەی جار رسول الله ﷺ بەو ناوانە بانگی دەکرد، پێیان گووت : ئەی رسول الله، ئەم کەسە بەم ناوانە تورە دەبێت و پێی ناخۆشە. ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی ﴿ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ ﴾ (**الحُجُرَاتِ** : ١١) .

**٧٦٠** - لە حەسەنی الجمحي دەفەرمووێ : (پیاوێک بە لای ئێمەدا تێپەڕی تۆزێک خوی ئافرەتانە دیاربوو، یەکێک گووتی : "ئەوە نێرە مووکە"، هاتینە لای عطاء ی کوڕی أبي رباح و پرسیارمان لێ کرد .

ئەویش فەرمووی : هەرکێ وایگوتوە با دەست نوێژ و نوێژ و ڕۆژووەکەی دووبارە بکاتەوە).

**٧٦١** - (له سعيد كوڕی عامر بن حذيم ەوە كە **- ئەميری حمص بوو لە قورەيش -** ، سواری ئەسپەكەی خۆی بوو و جوت پێی ئەسپەكەی بەرز كردەوە، يەكێك گووتی : ئەی پيس ئەوە چۆن قاچت بەرز كردەوە، ئەويش گووتی : ئەوە كێ بوو بەو ناوە بانگی كردم كە باوكم لێی نەناوم، ديارە بێ نيازە لەوەی فريشتەكان لەعنەتی لێبكەن)

**٧٦٢** - (له أبي أمامة رضي الله عنه كە گوێی لە پياوێك بوو بە پياوێكی موسڵمانانی گووت : وەزعت چۆنە ئەی كەچەڵ؟

أبو أمامة فەرمووی : ئەی كوڕی برام، تۆ وا ديارە لە لەعنەتی مەلائيكەتەكان بێ نيازيت).

---

**: ئەم دوو ئەثەرە ئەوەمان پێ دەڵێت كە بەڕاستی ناسناوادانان بۆ موسڵمان كە پێی ناخۆش بێت ئەوا مەلائيكەتەكان لەعنەتت لێدەكەن أعاذن الله و إياكم .**

**وريابن ئەمڕۆ ئەم خوە پيس و ناشرينە زۆر بەربڵاوە، يان چەندان ناوی پيرۆز هەيە سوكی دەكەن وەك (محمد، ئيبراهيم، أحمد) لە كاتێكدا الله دەفەرمووێ : ﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴾ .**

**بۆی هەيە ئەوەی تۆ بە سووك سەيری دەكەی مەقامی لەلای الله زۆر گەورە بێت وەك لە فەرموودەكانی ترهاتووە . .**

**بەڵام سوننەتە بەناوێك بانگی بكەی كە خۆی پێی خۆشە.**

**٧٦٣** - له ئەبوو عاليەوە دەربارەی کەلامی الله ﷻ کە ﴿ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ ﴾ دەفەرمووێ : بە موسڵمانێک مەڵێ ئەی فاسق، ئینجا ئەوەیشی خوێندەوە : ﴿ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ (**الحُجُرَاتِ** : ١١)



## باب : (٤٨)

## ئەوەی هاتووە لەسەر تاوان و کەڕاهەتی سزادانی کۆیلە، یان عەیبدار کردن و شێواندنی



٧٧٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەهەشت کەسی خیانەتکار، وە ئەوەی بەخیل بێت، وە ئەوەی خووی بە ناشرینی گرتوە).

٧٧٦ - أبي زبیر دەفەرمووێ : (لە پیاوێکەوە لە ئەهلی مەککەوە کە ئیمامی عمری بینی، دەهاتە دەرەوە لەو دەرگایەی بۆ الصفا دەڕوات، کچێکی کۆیلە هەستا بۆلای هات، وە گوتی : ئەی ئەمیری باوەڕداران، من پەنا بەتۆ دەگرم لە ستەم.

ئەویش فەرمووی : (چیت بەسەرهاتووە)

وتی : گەورەکەم سزای دام لە سەر پشکۆیەک ئاگری دانام، هەتاکو شوێنی دانیشتنم سوتا، ناردی بەدوای گەورەکەیدا .

پێی فەرموو : ئایا نەتدەتوانی بە شتێکی تر سزای بدەیت جگە لە سزای اللە؟ ئەگەر تۆڵە بکرابوایەوە لە گەورە لەسەر کۆیلەکەی ئەوا وامدەکرد، ئینجا **١٠٠** دانە قامچی لێیدا، وە بە کۆیلەکەی ئازاد کرد).

**٧٧٧** - (لە الحارث ەوە لە ئیمامی عەلی ەوە رضي اللە عنە کە پیاوێک نێو چەوانی کۆیلەکی خۆی داخ کردبوو، ئیمامی عەلی ش ئازادی کرد).

**٧٧٨** - عبداللەی کوڕی عمرو دەفەرمووێ : الزنباع بن روح کۆیلەیەکی هەبوو بەناوی ابن سندر کە ئەویش کۆیلەیەکی تری ئافرەتی گرتبوو و ماچی کردبوو بەزۆری، ئەویش واتا - **الزنباع** - گرتی و لووتی قرتاند و هەڵکەند، إبن سندر چووە لای رسول اللە ﷺ، ئەویش ناردی بە دوای زنباع وە پێی فەرموو : (شتێکیان پێ مەکەن و پێ مەسپێرن کە تواناییان نەبێ تێیدا، خواردنیان پێ بدەن لەوەی کە خۆتان دەیخۆن - **هەمان خواردن** - ، جلیان لەبەر بکەن لەو جلەی خۆتان لەبەری دەکەن، ئەگەر لە شتێکیان ناڕازی بوون بیانفرۆشن، لە کامەشیان ڕازی بوون بیانهێڵنەوە، بە هیچ شێوەیەك درووست کراوی اللە ﷻ سزا مەدەن)

وە رسول اللە ﷺ فەرمووی : (**هەر یەکێک بشێوێندرێ یان بیسوتێندرێ بە ئاگر ئەوا ئازاد کراوە، وە ئەو کەسە ئازاد کراوی اللە و رسول ەکەیەتی**).

٧٧٩ - گوێم لێبوو أبا العباس المبرد هۆنراوەی بۆ کۆمەڵێک کۆیلە دەگووت کە دڵی پێیان دەسوتا و دەیفەرموو : (ئای باوکە کۆیلە هەر چەندە تەمەنی بژی ئەگەر خۆیشی بەدڵ بێت و سەرسامی خۆشی بێت هەر زەلیلە، وا دەزانێ خەڵك یارمەتی دەری ئەوە، بەڵام ئەوانەی سەری دەخەن بەڕاستی کەمێکن).

٧٨٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک زلە لە کۆیلەیەک بدات، یان حەدێکی لەسەر تطبیق بکات کە نەیکردووە، کەفارەتەکەی بریتیە لە ئازاد کردنی).

٧٨١ - أبی السفر دەفەرمووێ : دانیشتبووم لای سوید ابن مقرن، کوڕەکەی ابن مقرن زلەیەکی دا لە کۆیلەکەی خۆیان، هێنایان بۆلای، پێی گووت : ئارام بگرە .

ئینجا ابن مقرن دەفەرمووێ : کۆیلەیەکمان هەبوو یەکێک لە ئێمە زلەیەکی لێیدا، ئەمەش باسکرا بۆ رسول الله ﷺ ئەویش ئازادی کرد، پێیان گووت ئەی رسول الله ﷺ ئەوان هیچ کۆیلەیەکیان نیە جگە لەمە .

ئەویش فەرمووی : (با خزمەتیان بکات تا لێی بێ نیاز دەبن).

٧٨٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر یەک لەوانەی کە خزمەتی ئێوە دەکات ئەگەر گوێڕایەڵی کردن هەمان خواردنی پێ بدەن کە خۆتان دەیخۆن، وە هەمان جلیان لەبەر بکەن کە خۆتان لەبەری دەکەن، وە هەر کامەش گوێڕایەڵی نەکردن وە ئەو دروست کراوەی الله دروستی کردووە سزای مەدەن).

٧٨٣ - أبو الزبیر دەگێڕێتەوە کە گوێی لە جابر ی کوڕی عبدالله بووە رضي الله عنهما کە فەرموویەتی کەوا : (رسول الله ﷺ نەهی کردووە لە نیشان کردن و داخ کردن لە ڕوخسار ، وە لێدان لە ڕوخسار).

٧٨٤ - لە مقدام ی کوڕی معدی کرب رضي الله عنه دەفەرمووێ : گوێم لە رسول الله بووە ﷺ نەهی کردوە لە زلە لێدان لە دەم و چاوی ئافرەتان، وە شێواندنی لووتیان، وە لە زلە لێدان لە ڕوخساری ئاژەڵەکان، وە فەرمووی : (بەڕاستی الله ﷻ دار و قامچی بۆتان داناوە، جەڵدیان بکەن، وە لە ڕوخساریان مەدەن - ئەم بەشەی ئەخیری فەرموودەکە بۆ ئاژەڵەکە دەگەڕێتەوە - ) .

٧٨٥ - لە شعبةوە دەگێڕێتەوە دەڵێ محمد ی کوڕی المنكدر پێی گووتم : ناوت چیە، منیش گووتم : شعبة .

فەرمووی : بۆی گێڕاینەوە أبو شعبة لە سوید ی کوڕی مقرن ەوە فەرمووی : (ئەگەر دەتبینین لە بەنی مقرن ئێمە حەوت کەس بووین وە تەنیا

یەک خزمەتکارمان هەبوو، یەکێک لە ئێمە زلەیەکی لێدا رسول الله ﷺ فەرمانی کرد کە ئازادی بکەن).

٧٨٦ - یحیي کوڕی إبن أبي کثیر دەفەرمووێ : عبدالله ی کوڕی سلام رضي الله عنه کۆیلەیەکی هەبوو زلەیەکی لێدا، ئینجا عبدالله کەوتە سەر چۆک و فەرمووی تۆڵەم لێ بکەوە .

ئەویش گووتی : تۆڵەت لێناکەمەوە گەورەم .

ئینجا عبدالله دەستی کرد بە گریان و فەرمووی : بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو تاوانێک لێخۆشبوونی بۆ هەیە جگە لە لێدان لە ڕوخسار).

٧٨٧ - لە عروةی کوڕی زبیر ەوە رضي الله عنه لە دایکە عائیشەوە رضي الله عنها دەفەرمووێ کە پیاوێک بە رسول الله ی گووت : ئەی رسول الله ﷺ من کومەڵێک کۆیلەم هەیە درۆم لەگەڵ دەکەن، وە خیانەتم لێدەکەن، و تورەم دەکەن، منیش لێیان دەدەم، و جنێویان پێ دەدەم ئایا من چیم لەسەرە؟

ئەویش فەرمووی : (سزادانەکەی تۆ بۆیان حساب دەکرێت، وە تاوانەکەی ئەوان حساب دەکرێ، ئەگەر هاتوو سزا دانەکەی تۆ کەمتر بوو لە تاوانی ئەوان ئەوا تۆ فضلت زیاترە لەسەریان، وە ئەگەر هاتوو سزاکەی تۆ و تاوانەکەی ئەوان یەکسان بوو ئەوا نە تۆ هیچت لەسەرە نە ئەوان، وە

ئەگەر هاتوو سزا دانەکەی تۆ قورِستر بوو لە تاوانەکەی ئەوان، ئەوا تۆڵەت لێدەکرێتەوە لەسەر ئەو زیادەیە) ئەو پیاوەش بە غەمباری و سەرسوڕمانەوە دانیشت لە بەرامبەر رسول الله ﷺ .

ئەویش پێی فەرموو : (چیتە بۆچی وای؟ مەگەر کتێبی الله ت نەخوێندۆتەوە کە دەفەرمووێ : | وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ | [الأَنبِيَاءِ: ٤٧] .

کابراکەش گوتی : ئەی رسول الله ﷺ واللهی من هیچ خێرێک نابینم جگە لە جیابوونەوە لێیان، تۆ بە شایەد دەگرم کە هەموویانم ئازاد کرد.

٧٨٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لە ئێمە نیە ئەو کەسەی لە ڕوومەتی خۆی بدات، یان بانگەوازی جاهلیەت بکات).

٧٩٠ - پیاوێک لە رسول الله ی پرسی ﷺ ئایا حەقی ئافرەت چیە لەسەر پیاوەکەی؟

ئەویش فەرمووی : (خواردنی بۆ دابین بکات ئەوەی پێویستی بوو، جلی بۆ بکڕێ و بۆی دابین بکا ئەگەر پێویستی بوو، وە بەهیچ شێوەیەک لە ڕوخساری نەدات، وە بێزراو و ناشرینی نەکات - واتا بە لێدان - ، وە گەر هەجری کرد بۆی نیە هەجری بکات جگە لە جێگای خەوەکەی).

٧٩١ - لە جابر ەوە رضي الله عنە دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ گوێدرێژێكی بینی كە ڕوخساری داخ كرابوو. فەرمووی : (ئایا من قەدەغەی ئەوەم نەكردووە لێتان، وە لەعنەتی الله لەو كەسە بێت كە ئەو ئیشەی كردووە)، وە قەدەغەی لێدان لە ڕوخساری كرد.

٧٩٢ - لە ابن عمر ەوە رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ قەدەغەی كرد لە لێدان لە ڕوخسار).

٧٩٣ - جابر رضي الله عنە دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ گوێدرێژێكی بینی كە ڕوخساری داخ كرابوو و نیشان كرابوو، لە نێوانی چاوەكانی دا، ئەویش فەرمووی : (لەعنەتی الله لەوە بێت كە ئەو شتەی كردوە، ئایا مەگەر من قەدەغەم لەوە نەكردووە كە لە ڕوخسار بدرێت؟

وە فەرمووی : لە ڕوخسار مەدەن).

٧٩٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر یەكێك لە ئێوە بەشەڕ هات با خۆی بە دوور بگرێت لە ڕوخسار).

---

١ - ئایا كۆیلە هی ئیسلامە وەك بێ دینەكان وا دەڵێن؟؟

ئەوە گومانی تێدا نیە كە بە كۆیلە كردنی خەڵك دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جاهیلیەت ئەوكاتەی خەڵك لەوپەڕی بێ دینیدا بوو ئەگەریەكێك قەرزداری بو ایە یان

بێ دەسەڵات بوایە ئەوا دەیانگرت و دەیانکردە کۆیلە و هەموو بێ ڕێزیەکیان بەرامبەر دەکردن، بەڵام کە دینی ئیسلام هات هەموو ڕێگاکانی کردن بە کۆیلەی خەڵکی کرد بە یەك ڕێگا ئەویش لە کاتی جەنگدا کاتێک کافرێک دەگریت بە دیل بۆت هەیە بیکەیتە کۆیلە، ئەویش بە مەرجی خۆی وەك لە فەرموودەکانی سەرەوە هاتووە کە دەبێ ڕێزیان لێ بگیرێت و شتانێکیان پێ نەکەی کە پێیان ناکرێت و ئەزیەتیان نەدەی چ جلێکت لەبەرکرد هەمان جلی پێ بدەی نەوەك جلی دڕاو و بێ کەلك، وە هەروەها دینی ئیسلام دەیان ڕێگەی دانا بۆ ئازاد کردنی کۆیلە دەبینین لە فقە دا هەرکوشتن کەفارەتەکەی بریتیە لە ئازاد کردنی کۆیلە، ظهار کەفارەتی ئازاد کردنی کۆیلەیە، جوت بوون لە مانگی ڕەمەزان، وە تەنانەت بۆ پاداشت و صدقة بەم شێوەیە کۆیلە نەما بەڵام ئەمڕۆ کۆیلەکان بڵاوبونەتەوە و بە فەرمانی طاغوتەکان بۆ موچەیەکی کەم کراون بە کۆیلە.. ئەمەش دینی ئیسلام ڕێگری لێدەکات

بۆیە ئەوە ڕاستیەکەیە نەوەك ئێمە خۆمان لێ بێ ئاگا بکەین.

٢ - گەر سەیر بکەن لە بەشێک لە فەرموودەکان ناوی ئافرەتیشی تێدایە و بەڵام باسەکە باسی کۆیلەیە ئێستا کەسانی دڵ نەخۆش بیبینن سەد گومانیان بۆ دروست دەبێ .

ئەو فەرموودانە رسول الله ﷺ فەرموویەتی بەڵام ئەو نەیفەرمووە لێرەدا بەکار بهێنرێ و دابنرێ. ئەوە ڕوونە لای هەموو کەسێک کە قوڕەیش و عەرەب بەگشتی لە جەهالەتدا ئافرەتیان وەک کۆیلە سەیر دەکرد و ئەزیەتیان دەدا و زیندە بەچاڵیان دەکردن، وە ئەگەرکەوتبانە سوڕی مانگانە ئافرەتەکانیان لەخۆیان دور دەخستەوە و نانیان لەگەڵ جیا دەکردنەوە چونکە دەیانگوت پیسن، بەڵام رسول الله ﷺ وەک ڕەحمەتێک هات و شکۆی ئافرەتی گەڕاندەوە و تەنانەت دایکمان عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێ کاتێک من لە سوڕی مانگانە بووم ئاوم دەخواردەوە رسول الله ﷺ دەمی دەخستە شوێن ئەو جێگایەی کە من ئاوم پێی خواردووە ئەویش لەوێدا دەیخوارد) .

## باب : (٤٩)

## کەڕاهەت و تاوانی  ئەوەی کۆیلەیەک سەرپێچی بکات یان ڕابکات



٧٩٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کۆیلەیەک ڕابکات لە خاوەنەکەی ئەوا پاراستنی نەماوە لە لایەن الله و رسول ەکەی).

٧٩٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (کۆیلە ئەگەر ڕایکرد ئەوا نوێژی قەبووڵ ناکرێت تاکو نەگەڕێتەوە).

٧٩٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کۆیلەیەک وەربگەڕێ لە دین بۆ سەر شیرک ئەوا خوێنی حەڵاڵ دەبێت).

٨٠٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (کۆیلە ئەگەر ڕایکرد ئەوا نوێژی قەبووڵ ناکرێت تاکو نەگەڕێتەوە بۆ لای خاوەنەکەی).



# باب : (٥٠)

# (کەڕاهەتی بوختان کردن بە ئافرەتانی داوێن پاک



٨٠١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک بوختان بۆ کۆیلەیەکی ئافرەت بکات وە ئەو ئافرەتەش بەری بێت لەوەی کە دەیڵێ، ئەوا لە ڕۆژی قیامەت سزا دەدرێت).

٨٠٢ - لە إبراهیم ی نەخەعی ەوە دەفەرمووێ : (عبدالله ی کوڕی عمرو رضي الله عنها بیستی کە ئافرەتێک کۆیلەکەی زینای کردووە، فەرمووی : واللهی ئەگەر ئێمە جەڵدی نەکەین لە دوونیادا، ئەوا لە ڕۆژێکدا جەڵدی پێدەکەوێ کە زۆر قورسترە لەئێستا ئەویش لە ڕۆژی قیامەتە، ئافرەتەکەی کە ئەمەی بیستەوە ئەوا کۆیلەکەی ئازاد کرد؟

وە گووتی : بەڵکو ئازاد کردنەکەی کەفارەتی ئەوە بێت بۆی کە بوختانەکەی کردبوو - و اتا ئافرەتەکە بوختانی بە کۆیلەکە کردبوو - ).

٨٠٣ - طيسلة بن على دەفەرمووێ : پرسیارم كرد لە إبن عمر رضي الله عنهما گوتم : حدیثێكم پێ بڵێ لەسەر تاوانە گەورەكان .

فەرمووی : رسول الله ﷺ فەموویەتی : (تاوانە گەورەكان بریتین لە : هاوبەش بڕیاردان بۆ الله، وە بوختان كردن بە ئافرەتی داوێن پاك) .

پێم گوت : ئایا ئەم تاوانە لە پێش كوشتنیشەوەیە؟

فەرمووی : (بەڵێ، وە قێزەونترە) .

ئینجا فەرمووی : (كوشتنی ئافرەتێكی ئیماندار، وە ڕاكردن لەكاتی جەنگ، وە خواردنی ڕیبا، و خواردنی ماڵی هەتیو، وە ئەزیەت دانی دایك و باوكی موسڵمان - دایك و باوكی كافریش دەگرێتەوە - ).

٨٠٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بوختان كردن بە ئافرەتی داوێن پاك كرداری سەد ساڵ دەڕوخێنێ و پوچەڵ دەكاتەوە).

٨٠٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر كەسێك تاوانی زینا بداتە پاڵ ئافرەتێك و نەیبینیبێت كە زینا بكات، لە ڕۆژی قیامەتدا جەڵد دەكرێت بە قامچی ئاگر).

---

: بوختان كردن بە ئافرەتی داوێن پاك یەكێكە لە تاوانە گەورە و لەناوبەرەكان، گەریەكێكت نەدیتبێ زینا بكات چ ئافرەت چ پیاو ئەوا بلێی زینای كردوە و چوارشاهێدی

عدل وموسڵمانت نەبێ ئەوا دەبێ هەشتا دار ت لێبدرێ وەک الله دەفەرمووێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةً وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدًاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾ برِوانە تەفسیری ئایەتەکە . .

بەڵام ئەگەر دیتیشت کەوا زینا دەکەن ئەوا تۆ لەوکاتەدا پێویستە لەسەرت تا دەتوانیت ستریان بکەیت و ئامۆژگاریان بکەی لعلە بگەڕێنەوە و تەوبە بکەن، چونکە موسڵمان پێویستە موسڵمان ستربکات وەك لە وانەکانی پێشوتر ئاماژەمان پێی کردبوو، وە بە تایبەت ئەمڕۆ کە سەردەمی فیتنەیە وکە حوکمی ئیسلام نیە موسڵمان دەبێت زۆرزۆرژیر بێت ناکرێ هەربابەتێک باسکرا بە تایبەت ئەم بابەتە گەور انە نابێ قسەی تێدابکات بەبێ علم چونکە پەنا بە الله ئەوکات ئەمیش تێیدا بەشداردەبێت، بۆیە تا دەتوانن خۆتان بپارێزن لە بابەتی عرض و ناموسی خەڵك بە تایبەت موسڵمان، نابێت بە هیچ شێوەیەک بوختان بکەی بە ئافرەتانێك کە داوێن پاکن، بە هەزاران خێزان هەڵوەشاوەتەوە لەسەر بوختان کردن، تکایە ماڵی خۆتان وخەڵک وێران مەکەن...



# باب : (٥١)

# ئەوەی هاتوە لەسەر کەڕاهەتی یاری کردن بە زار و مار و طاوڵە و شەترەنج و جگە لەوانیش



**٨٠٦** - معمر بن راشد دەفەرمووێ : پێم گەیشتووە کە کۆمەڵێک منداڵ بە یەحیای کوڕی زەکەریا یان گوت علیهما السلام : وەرە لەگەڵمان بچین یاری بکەین .

فەرمووی : من بۆ یاری دروست نەکراوم، ئەوەش ئەو ئایەتەیە کە اللّٰه دەفەرمووێ : | يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا | **(مَريَمَ: ١٢)** .

**٨٠٧** - إبن عمر رضي اللّٰه عنهما دەفەرمووێ : کە رسول اللّٰه ﷺ لەدوای پیاوێک دەگەڕا کە دیار نەبوو، فەرمووی : (کوا فلاّن کەس) .

یەکێک گووتی : چوە تا یاری بکات .

فەرمووی : (ئێمە لە کوێ و یاری لە کوێ - واتا ئەوە پیشەی موسڵمان نیە - ) .

٨٠٨ - لە ئەبوو موسای ئەشعەری ـەوە رضي الله عنە دەفەرمووێ : (هەر كەسێ یاری بكات بە چوارگۆشە - زار - ئەوا سەرپێچی رسول الله ی ﷺ كردووە) .

٨٠٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر كەسێك یاری بكات بە چوارگۆشە - زار- ئەوا سەرپێچی الله و رسول ـەكەی كردووە).

٨١٠ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هیچ كەسێك نیە كە چاوەڕێی ئەوە بكات زار و مارەكە چی بۆ دەردەچێ ئەوا سەرپێچی الله و رسول ەكەی كردووە).

٨١١ - لە ئەنەس ی كوڕی مالكەوە رضي الله عنە دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ قەدەغەی كردووە لە یاری كردن بە چوارگۆشە) .

٨١٢ - عبداللهی كوڕی مسعود رضي الله عنە دەفەرمووێ : (ئامان وریابن لەو چوارگۆشەیەی كە هەڵ دەدرێت، چونكە ئەوە قوماری عەجەمە - واتا غەیرە عەرەب - ).

٨١٣ - إبن عمرـەوە رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (ئەگەر دەستم بخەمە ناو خوێنی بەراز، زۆر لام چاكترە لەوەی یاری بكەم بە طاوڵە و شطرنج).

٨١٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک یاری بکات بە طاولە و شطرنج وەک ئەوە وایە کە دەستی خستبێتە گۆشتی بەراز یان خوێنەکەی).

٨١٦ - على کوڕی أبي طالب رضي الله عنه دەفەرمووێ : سەلام لە شەش جۆری خەڵک مەکە : یەهود، نصارا، مەجوس - ئاگرپەرست - ، ئەوانەیشی لەبەردەمیان مەی و ڕەیحان هەیە، ئەوانەی بە گاڵتە جاڕیەوە سوکایەتی بە خەڵکی دەکەن، وەهاوەڵانی شطرنج - ئەوانەی شطرنج دەکەن - ).

٨١٧ - محمد کوڕی سیرین دەفەرمووێ : (خواردنەوە لە قومارەوەیە، وە قیژە و هاوار لە قومارەوەیە، وە پەڕی سەر و ڕیش لە قومارەوەیە، وەستان لە قومارەوەیە).

أبو سعید فەرمووی : ئەوە کاتێکە کە یاری بکەن لەسەر خواردنەوەی ئاو، وە دانانی پەڕ لە سەر و ڕیش، یان وەستان بەپێوە تا هیلاک بوون، یاخود هاوارکردن وەک گوێدرێژ، یان هاوارکردن وەکو کەڵەشێر و بێجگە لەوەش .

٨١٨ - إبن عمر رضي الله عنهما چواردە بەردی بینی هی دامە لە یەکێک لە ئەندامەکانی خێزانەکەی، گرتی و لەسەر سەریدا شکاندی).

**٨١٩** - (مالک کوڕی ئەنەس ڕقی لە یاری کردن بووە بە زار و مار و شطرنج).

**٨٢٠** - أم قثم دەفەرمووێ : ئیمامی عەلی رضي الله عنه هات بۆ لامان و ئێمەش یاریمان دەکرد بە بەردی دامە، فەرمووی : (ئەوە چیە؟) .

ئێمەش گوتمان ئێمە بە ڕۆژووین، حەزمان کرد یاری بەوانە بکەین .

فەرمووی : ئایا گوێزێکتان بۆ نەکرم بە درهەمێک بۆخۆتان یاری پێ بکەن؟ واز لەوە بهێنن؟

گوتمان : بەڵێ .

گوێزی بۆمان کڕی و ئێمەش وازمان لە بەردەکان هێنا).

**٨٢١** - مالکی کوڕی أنس دەفەرمووێ : (یەکەم کەس کە نوسینی عەرەبی هێنا و فێری بوو - کتێبی عەرەبی - ، وە زار، و شطرنج عمرو بن العاص بوو رضي الله عنه لە الحيرة فێری بوو).



## باب : (٥٢)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی کەڕاهەتی گوێگرتن لە قسەی دوو کەس یان کۆمەڵێک کە پێیان ناخۆشە



٨٢٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک گوێ ڕابگرێت لە قسەی خەڵکی، وە ئەوانیش حەز نەکەن کە گوێی لە قسەکانیان بێت وەک ئەوە وایە مس بکەن بە گوێیدا - لە ڕۆژی قیامەتدا مسی تواوە دەکەن بە گوێیدا - ).

٨٢٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک گوێ ڕابگرێت لە قسەی خەڵکی، وە ئەوانیش حەز نەکەن کە گوێی لە قسەکانیان بێت وەک ئەوە وایە مس بکەن بە گوێیدا - لە ڕۆژی قیامەتدا مسی تواوە دەکەن بە گوێیدا - ).

: بەڕاستی ئەمە دەردێکی زۆرزۆر بڵاوە کە زۆربەی فیتنەکان و ئاژاوەکان و کوشتن و طلاق لەو باسانەدا دێتە ئاراوە، گەر تێپەڕی و گوێت لێی بێ ئەوە کێشە نیە بەڵام نابێ گوێی بۆ هەڵبخەی تا ببیستی، وە حدیثەکان دەفەرمووێ گوێی لێبگرێ و اتا بە ئەنقەست. بۆیە تەنانەت مێردیش بۆی نیە گوێ لە قسەی خێزانەکەی بگرێت و بێ لە دەرگا دان بە ژوور بکەوێت بە تایبەت بە شەو لە کۆتاییەکاندا خۆشی بابێکی هێناوە لەسەرئەم باسە...



# باب : (٥٣)

## ئەوەی هاتووە لەسەر حەسادەت و پەنا گرتن بە اللە لێی



٨٢٤ - رسول اللە ﷺ دەفەرمووێ : (ئامان وریابن لە حەسوودی، چونکە بەدڵنیایەوە حەسوودی چاکەکان دەخوات هەر وەک چۆن ئاگر دار دەخوات).

٨٢٥ - لە هاشمی کوڕی عبداللەی کوڕی زوبەیرەوە دەگێڕێتەوە کە : عومەری کوڕی خطاب رضي اللە عنە توشی موصیبەتێک بوو، هاتە لای رسول اللە ﷺ و باسی خەم و پەژارەی خۆی لا کرد و داوای کرد کە کۆمەڵێک خورمای بۆ کۆبکاتەوە، ئەویش پێی فەرموو : (ئەگەر بتەوێت فەرمان دەکەم کە وشێك خورمات بۆ بهێنن، وە ئەگەر بتەوێت دوو وشەت فێر دەکەم کە زۆر باشترە بۆت لەوە) .

عومەر فەرمووی : فێرم بکە و فەرمان بکە بۆم بە وشێك خورما، چونکە پێویستمە.

فەرمووی : (وا دەکەم، بڵێ : اللهم بمپارێزە بە ئیسلام کە دانیشتوم، وە بمپارێزە بە ئیسلام کە پاڵکەوتووم، وە حەز و ویستی حەسودەکان مەهێنە دی لەسەرم - بەسەرمانی زاڵ مەکە - ، پەنا دەگرم بەتۆ بە هەر شەڕێك کە بەدەست تۆوەیە، وە داوات لێدەکەم لە خەیر کە هەمووی بەدەستی تۆوەیە).

٨٢٦ - سالم ی کوڕی عبداللهی کوڕی عمر دەیگێڕێتەوە لەباوکیەوە کە فەرموویەتی : ئێمە دانیشتبوین لای رسول الله ﷺ ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەویش فەرمووی : (ئێستا لەم دەرگایەوە پیاوێك بە دیار دەکەوێت بۆتان کە ئەهلی بەهەشتە) .

دەفەرمووێ : سعدی کوڕی مالك رضي الله عنه هاتە ژوورەوە، وە ئێمەش سەیریمان کرد و بینیمان و ئیرەیی مان برد پێی، وە ڕۆژی دووەمیش هەمان شتی فەرموو، دیسان سعد هاتە ژوورەوە، ڕۆژی سێیەمیش هەمان شتی فەرموو، دیسان سعد هاتە ژوورەوە، ئێمەش هیچ گومانمان نەبوو لەوەی کە لەگەڵ ئەویەتی.

عبدالله ی کوڕی عمر فەرمووی : من واز لەو بابەتە ناهێنم تاوەکو دوای نەکەوم و سەیری بکەم، و کردارەکانی ببینم.

دەفەرمووێ : چووم بۆ لای لە دوای عیشای ڕۆژی ئەخیر، لە دەرگای ماڵیانم دا، هات و دەرگای لێکردمەوە، بەخێرهاتنی کردم و ڕێزی لێگرتم و بە نازناوی خۆم بانگی کردم، وە فەرمووی : ئەی برازاکەم چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە.

گوتم : پێویستیەکم هەیە .

فەرمووی : بۆت جێ بەجێ دەکرێ یان دێیتە ژوورەوە.

گوتم : دەمەوێ بێمە ژوورەوە.

منی کردە ژوورەوە، وە پارچەیەك قوماشی بۆ ڕاخستم، منیش لێی ڕاکشام لە نزیك ئەو، تەواوی شەو چاودێریم دەکرد، هەر کاتێک خۆی دەجوڵاند و سبحان الله، و الله أکبر ی دەکرد، وە لا إله إلا اللهی دەکرد، وە الحمدللهی دەکرد، هەتاکو نزیکی بەرەبەیان ئینجا هەڵسا، هەڵسا و دەست نوێژی هەڵگرت، ئینجا هەڵسا و چوو بۆ مزگەوت، دوانزە ڕکات نوێژی کرد، لە هەر ڕکاتێکدا سورەتە المفصلەکانی دەخوێند - سورەتە کورتەکان - ، نە زۆر درێژ بوو، نە زۆر کورت بوو، لە دوای هەر دوو ڕکاتێک و دوای تەحیات دوعای دەکرد و صەڵاواتی لێدەدا لەسەر رسول الله ﷺ و سێ دوعای دەکرد و دەیگوت : اللهم لە دوونیادا چاکەمان پێ ببەخشە و بێنە ڕێگا وە لە قیامەتیشدا ناز و نیعمەت و چاکەمان پێ ببەخشە و بمانپارێزە لە سزای ئاگر، اللهم چی خەم و ویستی قیامەت و دوونیامان هەیە بۆمان جێ بەجێ بکە، اللهم داوای هەموو خێرێک لە تۆ دەکەم، وە پەنا بەتۆ دەگرم لە هەموو شەڕێک.

سەیرم کرد نوێژی کەمە، وە خوێندنەوەی قورئانی کەم بوو، وە دوعایشی کەم بوو، وا گومانم برد کە لەبەر من کە لای ئەوم بوومە ڕێگر لەوەی کۆمەڵێك عیبادەت ئەنجام بدات کە پێشتر ئەنجامی دەدا، لە نەفسی خۆمدا گوتم ئیلا

دووباره دەچمەوە لای، دووبارەم کردەوە لە هەمان ئەو کاتەی کە پێشتر چووبوم بۆلا.

عبدالله دەفەرمووێ : هاتە دەرەوە و بەخێرهاتنی کردم، وە فەرمووی : ئەی برازاکەم لەوانەیە لە نێوان خۆت و خێزانەکەت کێشەیەك هەبێت؟

گوتم : نا واللەهی ئەی مامە، هیچ شتێک لە نێوانی من و خێزانەکەم نیە جگە لە خەیر و چاکە .

گوتی : دەی بڵێ چیت پێویستە .

گوتم : بەڵێ دوای پێت دەڵێم .

گوتی : دێیتە ژوورەوە .

گوتم : بەڵێ .

هەمان عیبادەتی ئەنجام دا کە دوێنێ شەو ئەنجامی دا، نەفسم مورتاح نەبوو تا نەیکەمە سێ شەو، هەمان شتی ئەنجام دا لە دوعاکردندا، وە هەمان شت لە قورئان خوێندن، وە هەمان شت لە ڕکاتەکانی نوێژیدا.

دەفەرمووێ : ئینجا هات، گوتی کاتی نوێژە، هەڵسام لەگەڵی من و ئەو ڕۆیشتین، وە نوێژی بەیانیمان کرد لەگەڵ رسول اللّٰه ﷺ، تاکو خەڵکەکە کەم بوونەوە و ڕۆیشتن، هەڵسام چووم بۆلای، گوتم : ئەی مامە، ئەو پێویستەی وایکرد کە شەو لات بمێنمەوە پێت بڵێم؟

گوتی : بەڵێ، چی بوو؟

گوتم : مامەوە لەلات، بۆ ئەوەی اللّٰه ئیمان و کردارم زیاد بکات بەهۆی تۆوە، لە نوێژ، وە لە دوعا کردن، بەڵام ئەوەی تۆ زۆر کەم بوو، وە وا گومانم برد بەهۆی منەوە ڕێگریت لێکرابێ کە ئەو عیبادەتانە بکەی کە کاتێک لە تەنیایی دەیکەی.

وە فەرمووی : شەو لام مایەوە بەهۆی ئەم شتەوە؟، وە من لاواز و کەم تەرخەم نیم، هەر ئەوەبوو کە بینیت.

گوتم : من اللّٰه ـت دەخەمەوە، لەگەڵ ئەخلاقیات و خوڕەوشتی ئیسلامەتی، ئایا من بوومە ڕێگر لەوەی کە شتێك نەکەی کە پێشتر ئەنجامت داوە؟

فەرمووی : اللهم نەخێر.

کاتێک هەڵسام کە بڕۆم، بانگی کردم، فەرمووی : بگەڕێوە ئەی کوڕی براکەم، یەك ڕەوشتی ترم هەیە، دەچمە سەر جێگای ڕاکشان و خەوتنەکەم، وە هیچ ڕق و حەسودیەك نیە لە دڵمدا بەرامبەر هیچ موسڵمانێک .

إبن عمر فەرمووی : بەڕاستی ئەوەیە تۆی گەیاندوە بەو پلەیە).

٨٢٧ - الزهري دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ ئەنەسی کوڕی مالک فەرمووی : ئێمە ڕۆژێک دانیشتبووین لای رسول الله ﷺ و فەرمووی : (ئێستا لای ئەم دەروازەیەوە پیاوێکتان بۆ دەردەکەوێت لە ئەهلی بەهەشتە) .

پیاوێک لە أنصاریەکان هاتە ژوورەوە لە ڕیشیەوە تەڕایەتی دەست نوێژ دیاربوو، نەعلەکانی بە دەستە چەپ گرت و سەلامی لێمان کرد، بۆ ڕۆژی دواتر دیسان رسول الله ﷺ هەمان شتی فەرموو، دیسان ئەم پیاوە دەرکەوتەوە وەك جاری یەکەم و دوێنێ، وە بۆ ڕۆژی سێیەم دیسان رسول الله ﷺ هەمان شتی فەرموو، دیسان هەمان کەس دەرکەوتەوە بە هەمان حاڵەتی یەکەمجار.

کاتێک رسول الله ﷺ هەڵسایەوە عبداللّٰهی کوڕی عمرو کوڕی عاص دوایکەوت، پێی گووت : من لەگەڵ باوکم تۆزێک دەمەقاڵێمان بووە، وە سوێندم خواردووە کە سێ ڕۆژ نەچمەوە بۆ لای .

پێم گووت : ئایا تۆ دەتوانی ئەم سێ ڕۆژە بمگریتە خۆت .

فەرمووی : بەڵێ.

أنس ی کوڕی مالك فەرمووی : عبداللّٰه ی کوڕی عمرو باسی کرد بۆمان کە سێ شەو لای مایەوە، نەیبینی هیچ کاتێکی شەو هەڵبستێتەوە جگە لەوەی هەر کە بە ئاگا دەهات یان خۆی دەجوڵاند هیچی نەدەگووت جگە لە شتی

خەير و ذيكر، هەر كاتێك سێ شەوەكە تەواوبوو، لە نەفسی خۆم گووتم كردارەكانی زۆر كەمن .

گوتم : ئەی عبداللە لە نێوان من و باوكم هيچ تووڕەييەك نيە، وە هيچ لێك دابڕانێك نيە، بەڵام من سێ جار گوێم لە رسول اللە ﷺ بوو سێ جار لەبارەی تۆ فەرمووی : (ئێستا پياوێك لە ئەهلی بەهەشت بۆتان دەردەكەوێ)، هەر سێ جار تۆ بە ديار كەوتی، منيش ويستم لات بمێنمەوە و بۆ ئەوەی سەيری كردارەكانت بكەم، نەمبينی كە كرداری زۆر بكەيت، چ شتێك تۆی گەياندە ئەوەی كە رسول اللە فەرموويەتی؟

فەرمووی : هيچ شتێكم نيە ئيلا ئەوەی كە بينيت جگە لەوەی لەناو ناخمدا هيچ غەش ێكم لەدڵدا نيە بەرامبەر موسڵمانان، وە حەسودی بە هيچ شتێك نابەم كە اللە بە كەسێكی بەخشيوە.

عبداللە فەرمووی : ئەوەيە تۆی گەياندووە بەم پلەيە وە ئەوە شتێكە كە من ناتوانم بيكەم).

٨٢٩ - لە ئەبوو هورەيرەوە رضي اللە عنە دەفەرمووێ : گوترا ئەی رسول اللە ﷺ كام لە خەڵكی باشترينە؟

فەرمووی : (هەموو ئەوانەی دڵيان پاك و ڕوون و ئاشكرايە، وە زمانی ڕاستگۆيی لێ دێتە دەرەوە).

گوتیان : ئێمە دەزانین ڕاستگۆیی چیە، بەڵام ئەی دڵی ڕوون چیە و چۆنە؟

فەرمووی : (ئەودڵەیە کە پارێزکاریی فەرمانی الله یە، وە دڵی پاک کراوەیە، هیچ تاوانێکی تێدانیە، وە دەست درێژی تێدانییە، وە ڕق و کینە، و حەسوودی تێدانیە).

**٨٣٠** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک کە ئێوارەی بەسەردا هات بڵێ : ئێوارەمان کردەوە و ئێوارە موڵکی الله یە، حمد و سوپاس بۆ الله، پەنا دەگرین بەو الله یەی کە ئاسمانەکانی ڕاگرتوە لەوەی بکەون بەسەر زەویدا ئیلا بە مۆڵەتی خۆی نەبێت لە هەر شەڕێک کە خلقی کردووە، و درووست کار و بەدیهێنەریانە، وە پەنا دەگرین بە الله لە شەڕی شیطان و هاوبەشەکانی، هەر کەسێک وابڵێت دەپارێزرێ لە هەموو ساحیرێک، وە فاڵچی، و شیطان و حەسوودەکان).

**٨٣١** - أبو سعید خدری رضي الله عنه دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ نەخۆش بوو، جبریل علیه السلام ڕوقیەی کردفەرمووی : بەناوی الله ڕوقیەت دەکەم، لە هەموو شتێک کە ئەزیەتت بدات، وە لە هەموو حەسوودێک و چاو پیسێک، الله شیفات بدات).

**٨٣٢** - لە باوکی صالح ەوە رحمه الله دەربارەی کەلامی الله کە دەفەرمووێ : ﴿أَمۡ لَمۡ يَعۡرِفُواْ رَسُولَهُمۡ فَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴾ (المُؤمِنُونَ : ٦٩)

## باب : (٥٤)

## ئەوەی هاتووە لەسەر ڕووخسەتی حەسوودی وە قسەی رسول الله ﷺ حەسوودی نیە جگە لە دووشت



**٨٣٣** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (حەسوودی درووست نیە ئیلا لە دوو شت نەبێ؛ پیاوێک کە الله ﷻ قورئانی پێداوە - فێرکردوە - ئەویش بەهۆیەوە تەواوی شەو زیندوو دەکاتەوە و تەواوی ڕۆژیش، وە پیاوێک الله ﷻ ماڵی پێ داوە، ئەویش لێی دەبەخشێت لە تەواوی شەو و تەواوی ڕۆژدا).

**٨٣٤** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (حەسوودی درووست نیە ئیلا لە دوو شت نەبێ؛ پیاوێک کە الله ﷻ ماڵی پێیداوە ئەویش هەر لێی دەبەخشێ لە حەقدا تا هیلاك دەبێ، وە پیاوێکیش الله حیکمەتی پێ بەخشیوە، ئەویش بەو حیکمەتە هەڵدەستێ و کاری پێدەکا وە خەڵکی فێردەکا).



## باب : (٥٥)

# ئەوەی هاتووە لەسەر کەڕاهەتی زانستی ئەستێرەناسی و پێشبینی کردن و قسە کردن لە غەیبدا و باڵندە فڕاندن

: باڵندە فڕاندن چیە؟ لە سەردەمی جاهیلیەتدا خەڵک گەربیانویستبایە سەفەرێک بکەن یان بازرگانیەک یان هەر شتێک بکەن کە تێیدا ڕەشبین بونایە ئەوا باڵندەیەکیان دەهێنا و دەیانفڕاند و دەیانگوت گەربەلای چەپدا بڕوات ئەوا وازدێنین گەر بچێتە لای ڕاستە ئەوا ئیشەکەمان خێری پێوەیە، طبعا ئەمڕۆ ئەوەش لەناو ئێمەی کورد ماوە کە یەکێک بەنیازی شتێک بێت گەریەکێک پژمێت ئەوا دەڵێن خێری پێوە نیە با وازی لێبهێنین، بەداخەوە هەمان شتن .



٨٣٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک بە شوێن زانستی ئەستێرە بکەوێت ئەوا بەشێک لە سحری وەرگرتووە، هەر کەسێک زیاتر دوای بکەوێت ئەوا زیاتر سحری وەرگرتوە).

٨٣٨ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک بچێتە لای کاهنێک - ئەوانەی پێشبینی غەیب دەکەن - بۆ ماوەی چل ڕۆژ نوێژی لێ قەبووڵ ناکرێ).

---

: کە دەفەرمووێ نوێژی لێ قەبووڵ ناکرێ مانای ئەوەیە ئەجری نابێت و هەر فەرزەکەی لەسەر لادەچێ بەڵام هەر موسڵمانە بەڵام ئەوە یەکێکە کە بڕواشی پێنەکا بەس گوێی لێبگرێ یان بچێتە لای، بەڵام گەربڵێ نوێژەکە ناکەم تا ئەوچل ڕۆژە تەواو دەبێت ئەوا گومانی تێدا نیە کافردەبێ ولەدین دەردەچێت .

٨٣٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێک پێشبینی غەیب بکات - یاخود داوای بکات - ، یاخود باڵندە بەکاربهێنێ بۆ ئەوەی سەفەرەکەی ڕەت بکاتەوە، لە ڕۆژی قیامەتدا پلە بەرزەکانی بەهەشت نابینێت).

٨٤٠ - معاوية ی کوڕی الحكم السلمي رضي الله عنه دەفەرمووێ : گوتم بە رسول الله ﷺ: پێشتر باو باپیرانمان دەچونە لای کاهین ەکان لە سەردەمی جاهیلیەتدا .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (نەچن بۆ لای کاهنەکان).

گوتم : وە ئێمە باڵندەمان دەفڕاند - کاتێك کۆمەڵێك شت لە ناخمان دروست دەبوو - .

ئەویش فەرمووی : (ئەوە تەنیا شتێکە بە نەفسی ئێوەدا دێت، زەرەری پێ ناگەیەنێت).

٨٤١ - أبي الدرداء رضي الله عنه دەفەرمووێ : (سێ شت هەیە لە هەر کەسێکدا هەبێت ئەوا نابێت بە دانیشتووی پلە بەرزەکانی بەهەشت؛ چوون بۆ لای کاهن - پێشبینی غەیبی بۆ بکرێ - ، وە هێلێك دیاری بکات - بلێ ئەو ڕێگایە بەرەکەتی پێوەیە - ، یان باڵندە بەکاربهێنێ بۆئەوەی سەفەرەکەی ڕەت بکاتەوە).

٨٤٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ناچێتە بەهەشت هەر کەسێک باوەڕ بە سحر بکات).

٨٤٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئیشی ئەو کەسەی کەڵەشاخ دەکات پیسە، پارەی داوێن پیس - زیناکار- پیسە، ئەو پارەیەی کاهن وەریدەگرێت پیسە).

---

: ئەم فەرموودەیە نسخ بۆتەوە بەشی یەکەمی بەوەی کە رسول الله ﷺ کەڵە شاخی کردوە و دینارێک یان دوو دیناری داوە بەو کەسەی بۆی کردوە، بەڵام گەر بە تایبەت ئیشی کەڵە شاخ بکات و پارە وەربگرێ ئەوا فەرموودەکە دەیگرێتەوە الله أعلم .

٨٤٤ - طاوس دەگێڕێتەوە لە إبن عباسەوە رضي الله عنه کە پێیان گووت دەربارەی کۆمەڵانێک کە (أ ب ج) پیتەکان دەنوسن و دەڕوانن لە ئەستێرەکان.

فەرمووی : (من وای نابینم ئەوەی ئەم کارە دەکات هیچ بەشێکی هەبێت لای اللە).

٨٤٥ - رسول اللە ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر باسی قەدەر کرا دەمتان بگرن، وە ئەگەر باسی ئەستێرەکان کرا دەمتان بگرن، وە ئەگەر باسی هاوەڵانم کرا دەمتان بگرن).

٨٤٦ - عەلی رضي اللە عنە دەگێڕێتەوە لە رسول اللە ەوە ﷺ کە فەرموویەتی : (ئەی عەلی، لەگەڵ ئەهلی ئەستێرە ناسەکان دامەنیشە - وەك ئەمڕۆ ئەوەی دەڵێن ئەستێرە گەردوون بەڕێوە دەبات - ).

٨٤٧ - لە عەلی ەوە دەگێڕێتەوە کە رسول اللە ﷺ لە بارەی ئایەتی | وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ | (**الوَاقِعَة: ٨٢**)

فەرموویەتی : (هاوبەش بڕیار دانەکەتان دەڵێن کە بارانمان بۆ باری بەهۆی فڵانە خولگە و فڵان تیشك، وە بەهۆی فڵان ئەستێرە و فڵان).

٨٤٨ - ئەبوو هورەیرە رضي اللە عنە دەفەرمووێ : رسول اللە ﷺ بەیانیەک فەرمووی : (ئایا نابینن کە دروستکارەکەتان ﷻ چی دەفەرمووێ؟ فەرموویەتی : هیچ نیعمەتێک نەبووە کە بەسەر بەندەکانم

دا بەخشیبێت، ئیلا بەشێک پێی کافر دەبن، دەڵێن بارانمان بۆ باری بەهۆی ئەستێرەکان).

**٨٤٩** - حمیدی کوڕی الهلال دەفەرمووێ: (سەفەرم کرد لەگەڵ مسلم بن یسار سەفەرێک لە نێوان مەککە و مەدینە، سەیری مانگم کرد، گوتم: ئەم شەو مانگ دادەبەزێت لە فڵانە خولگە و فڵان شوێن.

مسلم پێی گووتم: مەه - **واتا ئەوە چی دەڵێی** - .

گوتم: عەرەب وادەڵێن.

گوتی: مەلائیکەیەك لە مەلائیکەتەکان ڕۆیشت بەڕێگادا، گەیشتە شوانێک و گوتی: ئەی شوان ئەوە ساڵ ڕۆیشت، و باران نەباری.

ئەویش گوتی: نەخێر، فڵان ئەستێرە و فڵان خولگە ماون بگەن.

مەلائیکەکە فەرمووی: ببە بە گوێدرێژ، بوو بە گوێدرێژ.

ئینجا ڕۆیشت گەیشت بە باوکی شوانەکە، فەرمووی: ئەی بەندەی اللّٰه، ساڵ ڕۆیشت و باران نەباری؟

ئەویش گوتی: زانستی من چیە؟ زانستی ئەوە لای اللّٰه یە، ئەویش فەرمووی: گەر هاوشێوەی کوڕەکەتت بگوتبایە ئەوا تۆشم دەکرد بە گوێدرێژ، هەر وەک چۆن کوڕەکەت بوو بە گوێدرێژ.

ئەویش گووتی : سوێندت دەدەم بە اللە،لەسەر کورەکەم ئەی بەندەی اللە .

فەرمووی : برۆ لە فلان شوێن، بهێنەوە و بیبەستەوە لە عەمودێک و بۆم بهێنە .

گوتی : بۆتە گوێدرێژ و رزگاری نەبوو .

فەرمووی : بەیانی بۆم بهێنەرەوە .

فەرمووی : ببەوە بە پیاوەکە، گەڕایەوە و بووەوە بە مرۆڤ .

پێی گوت : چیت بینی لە خەونتدا؟

گوتی : فلان شت و فلان شتم بینی .

فەرمووی : وە بەڵام ئەتۆ نازانی چی هەبووە تا گەڕاویتەوە - واتا چیت بەسەرهاتووە - ، بەڵام زەخت لەخۆت دەکەی لە هەواڵی ئاسمانەکان؟).

٨٥٠ - رسول اللە ﷺ دەفەرمووێ : (چوار شت هەیە خەڵکی وازی لێناهێنن : تانە و ڕەخنە گرتن لە ڕەچەڵەک، وە شین و شەپۆڕ لەسەر مردوو، پێشبینی کردن بە جێگۆڕکێی خولگەکان، گواستنەوەی نەخۆشی : فلان وشتر توشی جرب بوو، سەد دانە وشتری تریش توش بوون، ئایا کێ یەکەم وشتری توش کرد؟).

---

: ئەوە مەبەست تێیدا ئەوەیە کە شتەکە تقدیری اللهیە نەوەك من تۆ تووش بکەم و تۆش من تووش بکەی .

بۆیە ئەم بابەتانە زۆر زۆر خەتەرن چونە لای فاڵچی و ساحیر وە سحر کردن و باوەڕ هێنان پێیان کە ئەوە کوفرە و پەنا بە الله ئەمڕۆ بە هەزاران کەس ئەم کوفرە بە پارە دەکڕن یان بە زینا و داوێن پیسیەوە دەیکەن لەسەری نارۆین خۆمان هەموو شتێک دەبینین .

وە بابەتی ئەستێرە و گەردون ئەوەش ئەمڕۆ زۆرزۆرە کە هەرکەسە و دەڵێ فلان ئەستێرە و ایلێیێ وادەبێ مانگ بچێتە ئەولای ئەو شتە ڕوودەدا کە ئەوەش هاوبەش بڕیاردانە بۆ الله و قسە کردنە لە ویستی الله .

بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بابەتانە بابەتی قەدەر بخوێنن من لێرە لەسەری نارۆم .

**٨٥١** - لە ابن عباس رضي الله عنهما لە رسول الله وە ﷺ : (باڵندە مەفڕێنن - **شومێتی مەکەن** - ، وە نەخۆشی ناگوازرێتەوە، وە قوڵتان مەبەستن، صفر یش بەکارمەهێنن) .

پیاوێک لەناو کۆمەڵەکەدا گوتی : ئایا مەگەر کاتێک وشتر توشی نەخۆشی دەبێت، دەچێتە لای وشترێکی تر ئەویش دەیگرێتەوە و توشی دەبێت؟

فەرمووی : (ئەو وشترەی یەکەم جار توش بووە لەکێ گرتیەوە؟).

**٨٥٢** - عبداللهی كوڕی عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (كۆمەڵێك ڕەوشت هەیە ڕەوشت و صیفاتی جاهلیەتە : تانە دان لە ڕەچەڵەكی یەكتری، وە شین و شەپۆڕ و لە خۆدان، وە جێ گۆڕكێ بە مانگەكان، وە دەڵێن : لێكۆڵینەوە لە خولگەی ئەستێرەكان).

**٨٥٣** - میمون ی كوڕی مهران دەفەرمووێ : (چوار شت هەیە قسەی تێدا مەكە : ئیمامی علی، وە عثمان، و ئەستێرە، وە قەدەر).

**٨٥٤** - إبراهیم ی النخعي دەفەرمووێ : (ئەوان **- واتا هاوەڵەكان رضي الله عنهم -** ئەوەندە لە ئەستێرەكان فێر دەبوون كە ڕێنموویان بكات لە تاریكی وشكانی و دەریادا).

**٨٥٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (لە ئەستێرەكان خۆتان فێری ئەوە بكەن كە ڕێنموویی لێ وەرگرن لە وشكانی و دەریادا).



## باب : (٥٦)

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەوەی چی مستحبە بگوترێ لە کاتێکدا شومێتی لە دڵدا دروست دەبێت



٨٥٦ - عطاء إبن أبي رباح دەفەرمووێ : إبن عباس رضي الله عنهما کاتێک شتێک شومێتی دەدرایە پاڵ دەیفەرموو : (ئەوەی اللّٰه بیەوێت ئەوە دەبێ، هیچ هێزێک نیە ئیلا بە هێزی اللّٰه نەبێت، من بەندەی اللّٰه م، وە دەزانم کە هیچ کەسێک چاکە نایەنێت جگە لە اللّٰه، وە هیچ کەسێک خراپە لانادات جگە لە اللّٰه ﷻ).

٨٥٧ - عروة بن عامر القرشي رضي الله عنه دەفەرمووێ : پرسیار کرا لە رسول اللّٰه ﷺ دەبارەی طیرة و شومێتی، فەرمووی : (باشترینەکەی پێشبینی خێرە، وە موسڵمان ناگۆڕێت - واتا موسڵمان ناوەستێ لە کارەکەی - ، هەر کەسێک لەناو پێشبینیەکەی کە پێی ناخۆشە و حەزی لێنیە، با بڵێت : اللهم هیچ چاکەیەک نایەت ئیلا ئەوەی تۆ دەتەوێ، وە هیچ کەسێک خراپە

هەڵناگرێت جگە لەتۆ، وە هیچ هەوڵ و هێزێک نیە جگە لە هێز و هەوڵی اللہ نەبێت، ئینجا با پێویستیەکەی ئەنجام بدات).

---

: ئەم بابەتە پێویستی بە ڕوون کردنەوەیە لە بابی پێشووتر باسمان کرد کە یەکێک دەیەوێت بڕوات یان شتێک ئەنجام بدات کە توشی شومێتی دەبوو و پێشبینی خراپ دەکرا ئەوا یەکسەر وازی دەهێنا، بەڵام موسڵمان نابێت واز لە ئیشەکەی بهێنێت و توکل بە اللہ دەکات و دوعا دەکات و کارەکەی ئەنجام دەدات، وە ڕوونە لاتان کە رسول اللہ ﷺ دەفەرمووێ : (اللہ فەرموویەتی : من لەگەڵ گومانی بەندەکەمم، ئەگەر گومانی باشم پێ ببات ئەوا بۆی دەبێت، وە ئەگەرگومانی خراپم پێ ببات ئەوا بۆی دەبێت .

بۆیە بەردەوام بە و سارد مەبەوە احرص على ما ينفعك واستعن بالله).



## باب : (٥٧)

## ئەوەی هاتووە لەسەر کەڕاهەتی ئەزیەت دانان و شت فڕێدان لەسەر ڕێگەی خەڵکی



٨٥٨ - قیس کوڕی أبي حازم دەفەرمووێ : سعد کوڕی أبي وقاص رضي الله عنه وتاری دەدا و دەیفەرموو : (ئامان وریابن لەو شتەی لەعنەت دەهێنێ، ئەوەی کە یەکێک لە ئێوە ئەزیەتێک بخاتە سەر ڕێگایەک، هیچ کەس بەو ڕێگایەدا ناڕوات ئیلا دەڵێت : لەعنەتی الله لەو کەسە بێت کە ئەم کارەی ئەنجام داوە).



## باب : (٥٨)

# کەڕاهەتی ئەوەی هاتووە کە پیاو بڕوانێت لە ماڵی خەڵکی بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت لێیان



**٨٥٩** - سهیل دەفەرمووێ : من لەگەڵ باوکم بووم، هاوڕێیەکی ئەو هات، ڕوانی لەماڵێك و سەیری کرد، ئافرەتێکی بینی، گەیشت بە پیاوەکەی، پێی گوت : من سەیری ماڵم کرد، ئافرەتێکم بینی، ئەگەر شتێکتان بخستبوایە چاوم ئەوا بەفیڕۆ دەچوو، ئینجا فەرمووی :

ئەبوو هورەیرە بۆی گێڕامەوە لە رسول اللّٰە ﷺ کە فەرموویەتی : (هەر کەسێک بڕوانێت لە ماڵی خەڵکێک بەبێ مۆڵەتی ئەوان، ئەوان چاوی دەربێنن - کوێری بکەن - ، ئەوە چاوی بە فیڕۆ چووە - واتا : هیچیان لەسەرنیە - ).

---

: بەوردی بڕو انن لە ئەثەری ژمارە ٨٥٩ کابرای کە تاو انەکەی کرد نەچوو فێڵی شەرعی بهێنێتەوە یان بڵێ نەمزانی بینیم یان بڵێ خەتای ئافرەتەکەیە، هەزاربیانووی تر.

بەڵکو تسلیم بوو وگوتی گەرکوێرتان بکردبامایە ئەوا چاوم بەفیڕۆ دەچوو وهیچتان لەسەرنەبوو .

٨٦١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر پیاوێک سەیری ماڵتی کرد یان هاتە ژوورەوە بە بێ مۆڵەت پێدان، گەر دارێکت لێیدا و چاوی کوێر بوو، هیچ تاوانێکت لەسەر نیە).

٨٦٢ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر پیاوێک سەیری ماڵتی کرد بە بێ مۆڵەتی تۆ، گەر دارێکت لێیدا و چاوی کوێر بوو، هیچ تاوانێکت لەسەر نیە).

٨٦٣ - قیس کوڕی سعد دەفەرمووێ : چومە لایەکی دەرگا وەستام، رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەم شێوەیە، بەم شێوەیە، بەڕاستی مۆڵەت وەرگرتن لەبەر چاو پاراستن دانراوە).

٨٦٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەگەر پیاوێک سەیری ماڵی پیاوێک بکات - بچێتە ژوورەوە - ، ئەویش چاوی کوێر بکات، ئەوکات هیچی لەسەر نیە).

٨٦٦ - أنس ی کوڕی مالك رضي الله عنه دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ بە پێوە وەستابوو نوێژی دەکرد، یەکێک هات و سەیری ماڵی دەکرد، تیرێکی هەڵگرت و خستیە ناو کەوانەکەی و نیشانەی گرت لەلای چاوی کابرا).

٨٦٧ - أنس كوڕی مالك رضي الله عنه دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ لە ماڵەوە بوو، کابرایەك لەکونێکی دەرگاکەوە سەیری ماڵی دەکرد، رسول الله ﷺ تیرێکی هەڵگرت بەرەو ڕووی ئەوی برد، پیاوەکەش کشایەوە).

٨٦٨ - أنس رضي الله عنه دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ : (پیاوێک دەیڕوانی لە یەکێک لە ماڵەکانی رسول الله ﷺ، ئەویش بەرەو ڕووی هەڵسا و تیرێک یان ڕمێکی هەڵگرت، سەیری رسول الله م دەکرد ﷺ وەك بڵێی دەیەویست لێی بدات).

٨٦٩ - الشعبی دەفەرمووێ : (هەر کەسێک چووە ماڵی یەکێک بەبێ مۆڵەتی ئەوان، ئەوانیش چاویان کوێرکرد، هیچ تاوانێکیان لەسەر نیە).

٨٧٠ - الشعبی دەفەرمووێ : (ئەگەر پیاوێک بچێتە ماڵی یەکێک بەبێ مۆڵەتی ئەوان، سەگەکەی ئەوان بیگرێت و کەوڵی بکات - ئەزیەتی بدات - ئەوا ئەو ماڵە هیچ گرێنتیەك ناکەن، وە هەر پیاوێکیش چوە ماڵی یەکێک بە مۆڵەتی ئەوان، سەگەکەیان گرتی و ئەزیەتی دا، ئەوا دەبێ گرێنتی بکەن).

٨٧١ - سهل کوڕی سعد رضي الله عنه دەفەرمووێ : (پیاوێک لە کونێکی دەرگای رسول الله ﷺ چاوی بردبوە ژوورەوە، رسول الله ش ﷺ خوترمەیەکی پێبوو - دارێکی ڕوو تیژ- سەری خۆی پێ دەخوراند، کاتێک رسول الله ﷺ ئەوی

بینی فەرمووی : (ئەگەر بمزانیبووایە ئەوە سەیری من دەکات ئەوا دەمدا لەناو چاوی، مۆڵەت وەرگرتن دانراوە لەبەر پاراستنی چاو و نەزەر کردن).

٨٧٢ - سهل کوڕی سعد رضي الله عنه دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ خوترمەیەکی پێبوو، سەری خۆی پێ دەخوراند،پیاوێک هات، لە کونێکی دەرگایەکی ماڵەکانی رسول الله سەیری دەکرد، رسول الله ﷺ هەڵسا بەرەو ڕووی وە خوترمەکەشی لابوو، فەرمووی : (ئەگەر بزانم ئەوە سەیری من دەکات ئەوا دەمدا لەناو چاوی) .

وە فەرمووی : (مۆڵەت وەرگرتن دانراوە لەبەر پاراستنی چاو و نەزەر کردن) .



## باب : (٥٩)

# کەڕاهەتی ئەوەی هاتووە کە پیاو مۆڵەت وەربگرێت دوای ئەوەی چۆتە ژوورەوە



**٨٧٤** - مسلم کوڕی نذیر دەفەرمووێ : (پیاوێك داوای مۆڵەتی کرد لە حذیفەی کوڕی یەمان رضي الله عنه دوای ئەوە چوبوە ژوورەوە - **بینیبووی** - .

حذیفة فەرمووی : چاوەکانت هاتوونە ژوورەوە، بەڵام ناهێڵم لەشت بێتە ژوور).

**٨٧٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (سێ شت بۆ هیچ کەسێک حەڵاڵ نیە ئەنجامیان بدات : کەسێك نابێت پێش نوێژی بۆ خەڵک بکات و دوعا بە تایبەت بۆخۆی بکات بەبێ ئەوەی بۆ ئەوانی بکات بە گشتی و کۆمەڵ، ئەگەر وایکرد ئەوا خیانەتی لێیان کردووە، وە نابێت سەیری ناو ماڵ بکرێت پێش مۆڵەت وەرگرتن، ئەگەر وایکرد ئەوا وەك ئەوە وایە چوبێتە ژوورەوە، وە بۆی نیە نوێژ بکات لە کاتێکدا کە تەنگاو بێت) .

**: وەك حديث ضعيفه بەڵام وەك ئەثەری ثوبان صحيحه الله أعلم .**

**ئەمه باسی ئەوه دەكات كه يەكێك هاتبێته ژوور ئينجا بڵێ ڕوخسەت هەيه بێم، ئەو شتەش دروست نيه.**

٨٧٦ - ثوبان رضي الله عنه دەفەرمووێ : (سێ شت بۆ هيچ كەسێك حەڵاڵ نيه ئەنجاميان بدات : كەسێك نابێت پێش نوێژی بۆ خەڵك بكات و دوعا به تايبەت بۆخۆی بكات بەبێ ئەوەی بۆ ئەوانی بكات به گشتی و كۆمەڵ، ئەگەر وايكرد ئەوا خيانەتی لێيان كردووه، وه نابێت سەيری ناو ماڵ بكرێت پێش مۆڵەت وەرگرتن، ئەگەر وايكرد ئەوا وەك ئەوه وايه چوبێته ژوورەوه، وه بۆی نيه نوێژ بكات له كاتێكدا كه تەنگاو بێت).

٨٧٧ - عمرو كوڕی عبدالله كوڕی صفوان هەواڵی پێداين كه كلدة هەواڵی پێيداوه : كه صفوانی كوڕی أمية گەڕا بەدوای رسول الله ﷺ، كه ئەويش لەسەری بەرزاييەك بوو - تەپۆڵكە - ، دەفەرمووێ : چوم بۆ لای و مۆڵەتم وەرنەگرت .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (بگەڕێوه و بڵێ السلام عليكم، ئايا بێمه ژوورەوه).



## باب : (٦٠)

## (ئەوەی هاتووە لەسەر کەڕاهەتی چونە حەمام بەبێ لەبەرکردنی جلی بەشی خوارەوە - لە ناوك بەرەو ئەژنۆ -



٨٧٨ - عبداللّەی کوڕی عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : رسول اللّٰه ﷺ فەرمووی : (خراپترین ماڵ و شوێن حەمام ە) .

یەکێک یان - کەسانێک - گوتیان : لەوێدا چارەسەری نەخۆش دەکەن، وە چڵك و پیسی لادەبات .

رسول اللّٰه ﷺ فەرمووی : (ئەگەر هەر ئەنجامتان دا و چوون، وامەکەن ئیلا داپۆشراوبن - لەناوك بەرەو خوارداپۆشن - ).

٨٧٩ - عبداللّەی کوڕی عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : رسول اللّٰه ﷺ فەرموویەتی : (ماڵێکتان هەیە و دروستی دەکەن پێی دەگوترێ حەمام) .

گوتیان : ئەی رسول اللّٰه ﷺ لەوێدا پیسی و نەخۆشی لادەبات، فەرمووی : (هەر کەس چوو با خۆی داپۆشێ).

٨٨٠ - جابری كوڕی عبدالله رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ قەدەغەی كرد لەوەی بچینە حەمام ئیلا بە جلی بەشی خوارەوە نەبێت).

٨٨٢ - دایكمان عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ قەدەغەی كرد لەوەی پیاوان و ئافرەتانیش بچنە حەمامەكان، دواتر مۆڵەتی دا بە پیاوان كە بچن بە لەبەركردنی جلی بەشی خوارەوە).

٨٨٣ - دایكە عائیشەر رضي الله عنها خێزانی رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی حەمامەكان داپۆشەرێكن داتناپۆشن، وە ئاوەكەی پاكت ناكاتەوە، دروستكراوی موشریكەكانە، دەشتی - ناوچە - كافرانە، تەڵەی شەیتانە، بۆ پیاو حەڵاڵ نیە بچێتە ناوی ئیلا بە داپۆشراوی نەبێت، فەرمان بە موسڵمانان بكەن كە ئافرەتەكانیان سجن بكەن - نەچن بۆ حمام - ، پیاوان ڕاوەستاون بەسەر ئافرەتانەوە) .

٨٨٤ - عمری كوڕی خطاب رضي الله عنه دەفەرمووێ : (حەڵاڵ نیە بۆ پیاو بچێتە حەمام ئیلا جلی بەشی خوارەوەی لەبەر بێت - لە ناوك بەرەو خوار- ).

٨٨٥ - قبیصة بن ذؤیب دەفەرمووێ : (ئیمامی عمر قەدەغەی لێمان كرد كە بچینە حەمام ئیلا بەشی خوارەوەمان داپۆشراو بێ).

٨٨٦ - عمرو بن مهاجر دەفەرمووێ : خزمەتکارێکی تایبەتی عمری کوڕی عبدالعزیز بۆی گێڕامەوە کە : عمری کوڕی عبدالعزیز هەرگیز خۆی نەشۆردووە لەماڵەوە ئیلا خۆی داپۆشیوە لە ناوکی بەرەو خوار).

٨٨٧ - الأشعث دەگێڕێتەوە : کە ئیمامی حسن ی بصری پێی خۆش نەبووە بچێت بۆ حەمام ئیلا مەگەر بەشی خوارەوەی داپۆشیبێ، وە لەگەڵ کۆمەڵێک کە بەشی خوارەوەیان داپۆشیبێ، ئەگەر تێیدا هەبێت کە خۆی دانەپۆشی بێت ئەوا پێی خۆش نەبووە بچێت).

٨٨٨ - صالح الدهان دەفەرمووێ : (جابر کوڕی زید چوە حەمام بینی کەسانێکی لێیە ڕووتن، فەرمووی : سبحان الله، ئەوانە موسڵمانن؟! ئینجا دەستی خستە سەر چاوەکانی و چوە دەرەوە).

٨٨٩ - جسر القصاب دەفەرمووێ : پیاوێک پرسیاری کرد لە حەسەن ی بصری و پێی گوت : ئەی باوکی سعید، پیاوێك بچێت بۆ حەمام و بەشی خوارەوەی داپۆشیوە، وە خەڵکانێکی لێیە کە بەشی خوارەوەی خۆیان دانەپۆشیوە؟

فەرمووی : ئایا هیچ یەکێک لە ئێوە ناتوانێ کە مشتێك خۆڵ هەڵبگرێ و عەورەتی خۆی پێ داپۆشێ؟

گوتی : ئەی باوکی سعید لە حەمام دا خۆڵی لێنیە .

فەرمووی : واز لەو علوجانە بهێنە، عەورەتیان دەجوڵێت)

٨٩١ - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (عەورەتی پیاو بۆ پیاو، وەک عەورەتی ئافرەتە بۆ پیاو، وە عەورەتی ئافرەت بۆ ئافرەت، وەك عەورەتی پیاوە بۆ ئافرەت - واتا حەرامە - ) .

٨٩٢ - حيدة القشيري دەفەرمووێ : گوتم ئەی رسول اللّٰه ﷺ عەورەتمان، تا چەند دیار بخەین و چیمان لەسەرە؟

فەرمووی ﷺ : (دامێنت بپارێزە ئیلا لە خێزانت نەبێت، یان ئەو ئافرەتە کۆیلەیەی هەتە) .

گوتم : ئەی رسول اللّٰه ﷺ ئەی ئەگەر کۆمەڵێکمان بەیەکەوە بووین؟

فەرمووی : (ئەگەر توانیت نەهێڵیت هیچ کەس عەورەتت ببینێ مەهێڵە کەس بیبینێت).

گوتم : ئەی رسول اللّٰه ﷺ ئەی ئەگەر یەکێکمان بە تەنیا بووین؟

فەرمووی : (اللّٰه شایانترە لە هەموو شتێك کە شەرمی لێبکەی) .

٨٩٣ - سعید بن جبیر دەفەرمووێ : (چوونە حەمام بەبێ جلی بەشی خوارەوە حەرامە) .

٨٩٤ - عبدالعزيز بن أبي رواد دەفەرمووێ : نافع گوتی : ابن عمر هەرگیز نەدەچوو بۆ حەمام .

گوتم : ئەی کاتێک چاوەکانی کز و نابینابوون چی دەکرد؟

فەرمووی : فەرمانی دەکرد بە یەکێک لە کچۆڵە بچوکەکانی کە موەکانی بتراشێت).

٨٩٥ - نافع دەفەرمووێ : (إبن عمر رضي الله عنهما هەرگیز نەچوە بۆ حەمام)

٨٩٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (پیاو بۆی نیە سەیری عەورەتی پیاو بکات، وە ئافرەتیش بۆی نیە سەیری عەورەتی ئافرەت بکات).

---

: لە کتێبی المغني دا باسکراوە کە ئەم حەدیثانەی بەناوی رسول الله وە ﷺ هاتوون لەسەرحەمام هەموویان لاوازن .

وە ئەمرۆ ئەم بابەتە مەلەوانگەکان دەگرێتەوە کە بەهیچ شێوەیەك حەڵاڵ نیە بە شۆرتێکەوە بچن بۆ مەلەکردن ئیلا لە ناوك تا چۆك داپۆشرابێت ئەوە بە لایەنی ئەخیر کەمەکەی، گەرنا دروست نیە گەرچی خۆشت داپۆشراوبی کەسانێکی لێبن رووت بن ئەوا نابێت بچیت، والله أعلم .



# باب : (٦١)

## ئەوەی هاتووە لەسەر ڕووخسەت پێدان لە چوون بۆ حەمام



**٨٩٧** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (باشترین ماڵ حەمامە، ئەگەر پیاو چوە ناوی ئاگری جەهەننەمی بیر دەکەوێتەوە، پەنا دەگرێ بە اللّٰه لە ئاگر، وە خراپترین ماڵ ماڵی بوکی تازەیە، لەبەر ئەوەی پیاوی موسڵمان کە چوە ناوی ویستی زۆر دەبێت بۆ دوونیا، وە بێ ویست دەبێت لە قیامەت) .

**٨٩٨** - محمد کوڕی زیاد دەفەرمووێ : ثوبان ئازادکراوی رسول اللّٰه ﷺ دراوسێی من بوو، ئەویش دەچوو بۆ حەمام، گوتم : وە تۆ هاوەڵی رسول اللّٰه یت ﷺ دەچی بۆ حەمام؟

فەرمووی : رسول اللّٰه ﷺ دەچووە حەمام، وە کە دەهاتەوە دەگەشایەوە).

**٨٩٩** - أم سلمة رضي الله عنها دەفەرمووێ : (رسول اللّٰه ﷺ نوراویترین پیاو بوو، کاتێك کە تەمەنی کرد، هەر وەك خۆی مایەوە) .

**٩٠٠** - إبن عباس دەفەرمووێ : (ئەی خەڵكینە، لە اللّٰه بترسن و درۆ مەكەن، واللّٰهی رسول اللّٰه ﷺ هیچ كات جەستەی خۆی نەداوەتە بەردەستی كەس - **جەستەی نەبینراوە** - ) .

**٩٠١** - مكحول دەفەرمووێ : (كاتێك ابو الدرداء و هاوەڵانی رسول اللّٰه ﷺ هاتنە شام، چوون بۆ حەمام، خۆیان ئەشۆرد بە شاخی بزن) .

---

**: فەرموودەكان هەموویان لاوازن .**



# باب : (٦٢)

## کەڕاهەتی چوونی ئافرەتان بۆ حەمام



**٩٠٢** - لە دایکە عائیشەوە رضي الله عنها دەفەرمووێ : کۆمەڵێک ئافرەت هاتن بۆ لامان، پێم گوتن : ئێوە خەڵکی کوێن؟

گوتیان : خەڵکی شام ین، لە حمص نیشتەجێین .

گوتم : لەوانەیە ئێوە لەوانەبن کە دەچن بۆ حەمام؟

گوتیان : بەڵێ .

گوتم : گوێم لێبووە لە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (هەر ئافرەتێک پەچەکەی دابنێت لە جگە لە ماڵی خۆی، ئەوا ئەو سترەی لە نێوان خۆی و الله تبارك و تعالى دا هەیە لە خۆی داماڵیوە).

**٩٠٣** - لە ئەبوو أمامەوە رضي الله عنه دەفەرمووێ : ئیمامی عمری کوڕی خطاب فەرموویەتی : (حەڵاڵ نیە بۆ ئافرەت کە بچێت بۆ حەمام ئیلا مەگەر یەکێک نەخۆش بێت، بەڕاستی عائیشە خاتوون دایکی باوەڕداران لەسەر

جێگاكەی پێی گوتم و فەرمووی : بۆی گێڕامەوە خۆشەویستەكەم ﷺ لەسەر ئەم جێگایە .

فەرمووی : (ئەگەر ئافرەت پەچەكەی دانا لە جگە لە ماڵی مێردی خۆی، ئەوا ئەو پەردەیەی لەخۆی داماڵیوە كە لە نێوان خۆی و اللّٰه دا هەیە ﷻ نەوەستا تا گەشت بە عەرشی اللّٰه).

**٩٠٤** - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ : (هەر ئافرەتێك جلەكەی دانا لە جگە لە ماڵی مێردەكەی خۆی، ئەوا ئەو داپۆشین و پەردەی داماڵیوە لەخۆی كە لەنێوان خۆی و اللّٰه دا هەیە).

**٩٠٥** - أبو أمامة رضي اللّٰه عنه دەفەرمووێ : عمری كوڕی خطاب فەرموویەتی : (حەڵاڵ نیە بۆ هیچ باوەڕدارێك كە بچێت بۆ حەمام ئیلا بە جلی بەشی خوارەوە نەبێت، وە حەڵاڵ نیە بۆ هیچ باوەڕدارێكی ئافرەت كە بچێت بۆ حەمام جگە لەبۆ نەخۆشی، عائیشە خاتوون خێزانی رسول اللّٰه ﷺ بۆی گێڕامەوە، كە ئەوكات لەسەر جێگاكەی بوو .

فەرمووی : گوێم لێبووە لە رسول اللّٰه ﷺ كە لەسەر ئەم جێگایەی من بوو دەیفەرموو : (هەر ئافرەتێكی باوەڕدار پەچەكەی دابنێ لە جگە لەماڵی خۆی، ئەوا ئەو پەردەی داپۆشینەی لە خۆی داماڵیوە كە لە نێوان خۆی و پەروەردەگارەكەیەتی عَزَّ وَجَلَّ).

**٩٠٦** - لە دایکە عائیشەوە رضي الله عنها دەفەرمووێ : کۆمەڵێک ئافرەت هاتن بۆ لامان، پێم گوتن : ئێوە خەڵکی کوێن؟

گوتیان : خەڵکی شام ین، لە حمص نیشتەجێین .

گوتم : لەوانەیە ئێوە لەوانەبن کە دەچن بۆ حەمام؟

گوتیان : بەڵێ .

گوتم : گوێم لێبووە لە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (هەر ئافرەتێک پەچەکەی دابنێت لە جگە لە ماڵی خۆی، ئەوا ئەو سترەی لەخۆی داماڵیوە کە لە نێوان خۆی و الله تبارك و تعالى دا هەیە).

**٩٠٧** - عروەی کوڕی زوبەیر دەفەرمووێ : کۆمەڵێك ئافرەت لەسەردەمی حجاج دا کە خەڵکی شام و هەندێکیان خەڵکی عێراق بوون، مۆڵەت درا بە عێراقیەکان بەر لە خەڵکی شام بچنە ژوور، وە بە ئافرەتەکانی شام ی گوت : مەگەر ئێوە ناچن بۆ حەمام؟

گوتیان : بەڵێ، زەوی ئێمە زەویەکی ساردە .

ئەویش وتی : (هەر ئافرەتێك خۆی ڕووت بکاتەوە لە جگە لە ماڵی خۆی ئەوا ئەو داپۆشینەی لەخۆی داماڵیوە کە لە نێوان خۆی و الله ﷻ دا هەیە).

: له ڕووی سەنەدەوە هەموویان لاوازن بەڵام لەڕووی و اتاوە دروستن و پاڵشپشتیان زۆرە لە سوننەتدا .

وە بەهەمان شێوەی بابەتی پیاوان ئەوەش زۆر شت لەخۆی دەگرێت بۆ ئافرەتان کە حەڕامە، تێکەڵاوی و سفوری و تبروج و باقی ئەو شتانەی ئەمڕۆ بوون بە مۆدێل .



## باب : (٦٣)

## كەڕاهەتی ئەوەی هاتووە بۆ پیاو کە پیاوانی تر بۆی لەسەر پێ بوەستن - لەبەری هەڵبستنەوە -



**٩٠٨** - أبي مجلز لاحق ی کوڕی حميد دەفەرمووێ : ئیمامی معاويةی کوڕی أبو سفيان چووە ماڵێك عبداللهی کوڕی عامر لێبوو، لەگەڵ عبدالله ی کوڕی زوبەیر، ابن عامر هەستایەوە، وە إبن زبیر لە شوێنی خۆی نەجوڵا کە ئەویش قەڵەوترینیان بوو لەوێدا .

معاويه فەرمووی : دانیشە ئەی ابن عامر، چونکە بەڕاستی رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێك پێی خۆش بێت کە خەڵکی لەبەری هەستنەوە - لەبەری ڕاوەستن - ئەوا با شوێنی خۆی ئامادە بکات لەناو ئاگر).

**٩٠٩** - أبي مجلز دەفەرمووێ : (ئیمامی معاويه دەرچووە دەرەوە، ابن زبير و ابن صفوان کاتێك کە بینیان لەبەری هەستان .

فەرمووی : دابنیشن، گوێم لێبووە لە رسول اللّٰە ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەسێك پێی خۆش بێت و حەزبکات خەڵکی لەبەری هەستنەوە ئەوا با شوێنی خۆی یان ماڵێك بۆخۆی ئامادەبکات لەناو ئاگر).

**٩١٠** - أبي مجلز لاحق ی کوڕی حمید دەفەرمووێ : ئیمامی معاویەی کوڕی أبو سفیان چووە ماڵێك عبداللّٰەی کوڕی عامر لێبوو، لەگەڵ عبداللّٰە ی کوڕی زوبەیر، ابن عامر هەستایەوە، وە إبن زبیر لە شوێنی خۆی نەجوڵا کە ئەویش قەڵەوترینیان بوو لەوێدا .

ئیمامی معاویە فەرمووی : دانیشە ئەی ابن عامر، چونکە بەڕاستی رسول اللّٰە ﷺ دەفەرمووێ : (هەر کەسێك پێی خۆش بێت کە خەڵکی لەبەری هەستنەوە - لەبەری ڕاوەستن - ئەوا با شوێنی خۆی ئامادە بکات لەناو ئاگر).

**٩١١** - أبو أمامةەوە رضي اللّٰە عنە دەفەرمووێ : (رسول اللّٰە ﷺ هات بۆ لامان و لەسەر لقە دارێکی تەڕ شانی دادایەوە، ئێمەش هەر کە بینیمان هەستاینەوە .

فەرمووی : (ئەگەر منتان بینی هەڵمەستنەوە هەروەک چۆن عەجەمەکان وادەکەن، گەورەکانی خۆیان بەگەورە دادەنا) .

دەفەرمووێ : ئێمەش حەزمان کرد دوعامان بۆبکات .

فەرمووی : (اللهم لێمان خۆش بە، ڕەحممان پێ بکە، سەلامەتیمان پێ ببەخشە، وە لێمان ڕازی بە، وە لێمان قەبووڵ بفەرموو، بمانخە بەهەشتەوە، وە ڕزگارمان بکە لە ئاگر، کاروبارەکانم بە چاکی بۆ بەڕێبکە) .

دەفەرمووێ : حەزمان کرد دوعای زیاترمان بۆبکات .

فەرمووی : (ئایا هیچ شتێك ماوەتەوە؟) .

**٩١٣** - أبو أمامة رضي الله عنه دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ هات بۆ لامان، ئێمەش هەرکە بینیمان ڕێزمان گرت و بۆی هەستاینە سەر پێ، کاتێك ئێمەی بینی فەرمووی : (دانیشن، ئایا ئێوە وەك عەجەمەکان - واتە غەیری عەرەب - دەکەن؟) .

ئێمەش گوتمان ئەگەر دوعامان بۆبکەی لە لای اللّٰه عَزَّ وَجَلَّ، ئەویش فەرمووی : (اللهم لێمان خۆش ببە، اللهم ڕەحممان پێبکە، خواردنی حەڵاڵمان پێ ببەخشە، خواردنەوەی حەڵاڵمان پێ ببەخشە) .

گوتمان : ئەی رسول اللّٰه ﷺ ئەگەر زیاتر دوعامان بۆبکەی؟

فەرمووی : (مەگەر هیچی تر ماوەتەوە) .

---

: زۆر بەداخەوە کە ئەمڕۆ ئەو خوە ناشرینە زۆرە کە خەڵك پێی خۆشە لە جێگاکان لەبەری هەستن کە ئەمە سەرچاوەی خۆ بەگەورە زانینە، یاخود وەفدێکی بەدڕەوشت و بێ

دین دێت دەبێ هەمووی لەبەری هەستێ وفەرشی سوری لەبۆڕابخرێ ودەستی لەسەرسینگ بۆدابنرێ کە ئەمە هیچی شەرعی نیە و حەڕامە، بەڵام هەندێك کات جیا دەبێتەوە شتەکان : کە میوانێکت دێت سوننەتە بە هەموو شێوەیەك ڕێزی لێبگریت، وە نابێ پێت خۆش بێت لەبەرت هەستن گەرلەبەرت هەڵبستن لەبەرڕێزقەینا بەڵام لەدڵەوە نابێ پێت خۆش بێ، وە ئەگەرلەبەرت هەڵنەستان نابێ لەدڵت گران بێت) .



# باب : (٦٤)

# ئەوەی هاتووە لەسەر کەڕاهەتی سەفەر کردن بە ڕۆژانی هەینی



٩١٤ - رسول اللّٰه ﷺ دەفەرمووێ: (هەر کەسێك لە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆیەوە سەفەر بکات لە ڕۆژی هەینی، مەلائیکەتەکان وازی لێدەهێنن لەوەی هاوەڵێتی بکەن لەم سەفەرەدا، وە یارمەتی نادەن لە پێویستەکانی).

: ئەم فەرموودە لاوازە، وە سەفەرکردن لە ڕۆژانی هەینی کێشەی نیە بەو مەرجەی کە بەژداری وتاربکات جا لە هەر شوێنێك بێت، ئەوە گەر سەفەرەکەی حەڵاڵ بێت بەڵام گەر سەفەرەکەی حەڕام بێت ئەوا لە هەر ڕۆژێکدا بێت هەر حەڕامە، وە بە بەشداربوونی وتاری هەینی واجبە و سەفەرنابێتە عوزربۆی مەگەریەکێك نەخۆش بێت وتوانای نەبێت بچێ، وە لەسەرکۆیلە و ئافرەت و منداڵ و کافر پێویست نیە، تۆش گەریەکێکی لەوانە ئەوا قەینا مەچوو بۆوتاری هەینی.



## باب : (٦٥)

## ئەوەی هاتووە لەسەر کەڕاهەتی زەنگۆڵە لە سەفەردا یان لە کاروانەکاندا



**٩١٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (مەلائیکەتەکان هاوەڵێتی کاروانێك ناکەن کە زەنگی تێدا بێت).

**٩١٦** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەو پۆلە وشترەی کە زەنگی تێدا بێت ئەوا مەلائیکەتەکان نزیکی ناکەون).

**٩١٧** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (مەلائیکەتەکان هاوەڵێتی کاروانێک ناکەن کە سەگ و زەنگی تێدا بێت).

**٩١٨** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (مەلائیکەتەکان هاوەڵێتی کاروانێک ناکەن کە زەنگی تێدا بێت).

٩١٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (مەلائیکەتەکان شوێنی کاروانێك ناکەون ئەگەر زەنگی تێدابێت).

٩٢١ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (مەلائیکەتەکان هاوەڵێتی کاروانێک ناکەن کە زەنگی تێدا بێت).

٩٢٢ - خالد ابن معدان دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ کاروانێکی بینی کە زەنگۆڵەی تێدابوو .

فەرمووی : (ئەوە سەر کاروانەکەیان شەیتانە) .



## باب : (٦٦)

## کەڕاهەتی ئەوەی کە گەشتیار ئەگەر هاتەوە لە گەشتەکەی بە شەوان بەبێ دەنگی بچێتەوە ماڵی خۆی



**٩٢٥** - جابری کوڕی عبدالله رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ قەدەغەی لێکردین کە ئەگەر لە گەشتەکەمان هاتینەوە شەو بچینەوە ماڵەوە بەبێ ڕاگەیاندن پێیان).

**٩٢٦** - جابری کوڕی عبدالله رضي الله عنهما دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ قەدەغەی کردووە کە پیاو بەبێ دەنگی بچێتەوە لای خێزانی، دوای ئەوە ئێمە ئاگادارمان دەکردنەوە).

**٩٢٩** - جابری کوڕی عبدالله رضي الله عنهما دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ پێی فەرمووم : (مەچۆرە لای خێزانەکەت بەبێ دەنگی) .

وە فەرمووی : (ئەگەر ئێمە توشی زەرەرێک هاتین، فەرمان دەکەین کە وشترێکی بچوك بهێنن سەری ببڕین، ئەم شەوە ئەو وشترە بخۆین، کە

خێزانەکەمان گوێیان لێمان بوو و هەواڵی ئێمەیان پێگەیشت، خۆیان و جێگەکانیان پاك دەکەنەوە) .

گوتم : ئەی رسول اللە ﷺ واللەهی ئێمە فەرش و شتی ماڵمان نیە، فەرمووی : (ئەو دەیبێت، ئەگەر چوویتەوە کارێک بکە کارێکی ئاقڵانە بێت) .

**٩٢٨** - جابر رضي الله عنه دەفەرمووێ : عبداللەی کوری رواحە چووە لای خێزانەکەی، ئافرەتێکیش قژی بۆ دادەهێنا - هی خێزانەکەی - ، دەستی برد بۆ شمشێر، ئەو شتە باسکرایەوە بۆ رسول اللە ﷺ، قەدەغەی کرد کە پیاو لە شەودا بەبێ ڕاگەیاندن بەماڵەوە بگەڕێتەوە).

**٩٣١** - سعید کوڕی المسیب دەفەرمووێ : (رسول اللە ﷺ لەگەڵ کاروانێکدا بوو، کاتێك ئێوارەدا هات، فەرمانی کرد بانگکەرێك بانگ بکات : (کە بەشەوان بەبێ پێ ڕاگەیاندنی ماڵەوەتان مەچنەوە) .

دوو پیاو پەلەیان کرد و ڕۆیشتن هەردووکیان لەگەڵ ئافرەتەکانیان پیاویان بینی، ئەوەش باسکرایەوە بۆ رسول اللە ﷺ ئەویش فەرمووی : (من قەدەغەم لێتان کردووە کە لە شەودا بەبێ ئاگادارکردنەوە بچنەوە).

**٩٣٢** - ابن عمر رضي الله عنهما دەفەرمووێ : رسول اللە ﷺ لە غەزایەکدا گەڕایەوە، فەرمووی : (ئەی خەڵکینە لەشەودا مەچوون بۆلای خێزانەکانتان بەبێ ئاگادارکردنەوەیان، وە غەرایان مەکەن بەوەی بڕۆن) .

وە سوارێکی نارد بۆ مەدینە کە بڵێت ئەو خەڵکە بەیانی دەگەڕێنەوە ئاگاداربن.

---

**: لاوازە .**

**بێگومان ئەم بابەتە لەبەرئەوە دانراوە کە بۆنموونە جاران دەچوون بۆبازرگانی یان جیهاد یان هەر سەفەرێك تۆ پێویستە ئاگاداریان بکەیتەوە، لەبەرخیانەتکردن نا چونکە ئافرەتی موسڵمان کە رسول اللە ﷺ یەک لە سیفاتەکانی ئەوەیە کە گەرتۆ غائیب بووی ماڵەکەشت بپارێزێ وخۆیشی بپارێزێ، بەڵکوبۆئەوە دانراوە کە ئاگاداربن وخۆیان بڕازێننەوە بۆ پیاوەکانیان، وەك لە فەرموودەکەی جابر شتەکە زۆر ڕوونە، بۆیە پێویستە هەردووك لایەن گرنگی بەیەکتربدەن، نەوەك کە پیاو گەڕایەوە ببینێ ئافرەت مۆن وبێ تاقەت بێت و ئامادە نەبێت بۆئەوەی هاوسەرەکەی بڕو اتە لای وباقی شتەکانی تر، ئەم بابەتانە بەم شێوازە دەبێ تێبگەین .**



# باب : (٦٧)

## کەڕاهەتی ئەوەی پیاو بە تەنیا گەشت بکات



**٩٣٣** - مجاهد دەفەرمووێ : عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه فەرموویەتی : (لە گەشتەکانتاندا با سێ کەس بن، ئەگەر یەکێکیان مرد ئەوا بۆ خۆیان شتێکیان پێ دەکرێ، وە گەر یەک کەس بێت ئەوا شەیتانێکە، وە دووانیش دوو شەیتانن).

---

: ئەثەرەکە لاوازە، بەڵام دائیمە وا پێویستە کە لە سەفەردا سێ کەس زیاتر بین، وە یەکێک سەرکردە بێت .



# باب : (٦٨)

## کەڕاهەتی ئەوەی سەلام بکەیت لە یەکێک لە کاتێکدا کە میز دەکات



**٩٣٤** - نافع دەگێڕێتەوە : لە إبن عمرەوە رضي الله عنهما کە دەفەرمووێ : (پیاوێک بە لای رسول الله دا ڕۆیشت ﷺ ئەویش میزی دەکرد، پیاوەکەش سەلامی لێ کرد رسول الله ش ﷺ وەڵامی نەدایەوە).

**٩٣٥** - نافع دەگێڕێتەوە : لە إبن عمرەوە رضي الله عنهما کە دەفەرمووێ : (پیاوێک سەلامی لە رسول الله کرد ﷺ ئەویش دەست نوێژی هەڵدەگرت، رسول الله ش ﷺ وەڵامی نەدایەوە تا دەست نوێژەکەی هەڵگرت).

**٩٣٦** - حەسەنی بصری دەگێڕێتەوە لە براء کوڕی عازب ەوە رضي الله عنه کە بۆی گێڕاوەتەوە : کە سەلامی کرد لە رسول الله ﷺ ئەویش دەست نوێژی هەڵدەگرت، ئەویش وەڵامی نەدایەوە، تا لە دەست نوێژەکەی تەواو بوو ئینجا وەڵامی دایەوە).

**٩٣٧** - حەسەنی بصری دەگێڕێتەوە لە المهاجر بن قنفذەوە رضي الله عنه کە بۆی گێڕاوەتەوە : کە بەلای رسول الله ﷺ دا ڕەت بوو ئەویش میزی دەکرد، سەلامی لێ کرد، وەڵامی نەدایەوە تا لە دەست نوێژی هەڵگرت ئینجا وەڵامی دایەوە).

---

**: ئەوە شتێکە تایبەت بووە بە رسول الله ﷺ، لەوێدا دەفەرمووێ : عَنِ الْمُهَاجِرِبْنِ قُنْفُذٍ أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ يَبُولُ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ حَتَّى تَوَضَّأَ ثُمَّ اعْتَذَرَ إِلَيْهِ فَقَالَ: (إِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أَذْكُرَ اللَّهَ عَزَّوَجَلَّ إِلاَّ عَلَى طُهْرٍ).**

**أَوْ قَالَ: (عَلَى طَهَارَةٍ).**

**دوا تر کە دەست نوێژی تەواو بوو عوزری هێنایەوە بۆ صحابەکە و فەرمووی : من حەزناکەم کە یادی الله بکەم ئیلا بە دەست نوێژەوە نەبێت .**

**بۆ ئێمەی موسڵمان  سەلاممان لێبکرێت و دەست نوێژمان نەبێت ئاساییە وەڵام بدرێتەوە.**



## باب : (٦٩)

## کەراهەتی ئەوەی پیاو بە برای موسڵمانی بڵێت : ویل بۆ تۆ



**٩٣٨** - دایکمان عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ پێی گوتم : (ویحك) .

منیش بێتاقەت بووم، فەرمووی : (بێتاقەت مەبە لە وشەی ویحك، لەبەر ویح وشەیەکی رەحمەتە، بەڵکو بێتاقەت و خەمبار بە لە وشەی ویل) .



## الحمدلله

دوای ستایشێکی بێ پایان بۆ الله ﷻ الحمدلله الله منەتی لەسەرمان کرد ئەم کتێبەمان وەرگێڕا کرد کە بەڕاستی کتێبێکی زۆر زۆر گرنگە بۆیەش هەڵمانبژارد چونکە ئەمڕۆ بەداخەوەم ئەم خو ڕەوشتە ناشرینانە کەوتە ناومان بە تایبەت فێرخوازی زانست پێویستە دووربێت لەو ڕەوشتانە، داوامان لێتان ئەوەیە کە بە دڵسۆزی بیخوێننەوە و کاری پێ بکەن کەسمان نیە یەکێك لەم ڕەوشتە ناشرینانەی نەبێت بۆیە کە شتێکت خوێندەوە کەس نەیەتە بەرچاوت بەڵکو خۆمان با چاك بکەین .

لە کوردەواری دەڵێن : (خوی شیری، تاکو پیری)

ئەم پەندە پێچەوانەی ئەوەیە کە ئێمە باسمان کردووە، بەڵکو خو ڕەوشتەکان دەگۆڕدرێن و تەرك دەکرێن، بە خۆ لەسەر ڕاهێنان و دوعا کردن و لەبەر خاتری الله و بۆ نیشاندانی هێمایەکی ئیسلامیەتی پاك .

کەسمان نیە ئەم ڕەوشتانەمان نەبووبێت و گەر سەیریش بکەین زۆربەیمان تەرك کردووە،بۆیە هەوڵ بدەن و دوعا بکەن موسڵمانان .

قالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ : (خَصلتانِ لا تَجتمعانِ في مؤمنٍ : البخلُ وسوءُ الخلُقِ).

رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (دوو خورەوشت هەن لە مرۆڤی باوەڕدار کۆنابێتەوە : بەخیلی و ڕەوشت ناشرینی و خراپی) .

**رواهُ الترِّمذي**

بۆیە إن شاء الله بەوردی لەم کتێبە بڕوانن کە وەرمانگێڕاوە نزیکەی **٩٤٠** ئەثەرمان هێناوە کە تێیدا زیاد لە **١٠٠** ڕەوشتی ناشرین باسکراوە وە یەکەم کتێبە کە لەسەر ئەم بابەتە بنوسرێ بۆیە ئەومان هەڵبژارد، هەر بۆیە ڕەحمەتی اللە لەو کەسە بێت کە کاتێك ئامۆژگاری دەکرێ وەریبگرێ و کرداری پێ بکات چونکە اللە دەفەرمووێ : ﴿ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَشَدَّ تَثۡبِيتٗا ﴾ (النِّسَاءِ : ٦٦)

ئەگەر ئەوان کرداریان کردبووایە بەوەی ئامۆژگاری دەکران ئەوا زۆر باشتر بوو بۆیان، وە توندتر و قایمتر بوو بۆ جێگیربوونیان و دامەزراویان .

وە عبداللەی کوڕی مبارك رحمه الله دەفەرمووێ : (من أعظم المصائب للرجل أن يعلم في نفسه تقصيرا ثم لا يبالي و لا يحزن عليه) .

گەورەترین بەڵا و کێشە کە تووشی پیاو ببێت ئەوەیە کە لە نەفسی خۆیدا کەم و کوڕیەکانی بزانێت و گوێی پێنەدات و دڵگران نەبێت لەسەری) .

الله ﷻ لێمان قەبووڵ بفەرمووێت و نەیداتەوە بە ڕووماندا، الله تبارك وتعالى وامان لێبكات كە ڕەوشتە ناشرینەكان لە خۆماندا نەهێڵین، هەر هەڵەیەك هەبوو لە نوسیندا ئێوە بە چاكەی خۆتان لێمان ببورن و لەجێگەی خۆی چاكی بكەن، دوعای خێر بۆ منێكی بەندەیەكی فەقیر و تاوانبار بكەن .

دەستی یەكە بەیەكەی ئەوانە ماچ دەكەین كە یارمەتیدەرمان بوون بە ڕێكلام كردن و بە ڕاستكردنەوەی هەڵەكان، داواكارم لە الله ﷻ تەوفیقیان بدات و اللهم هیدایەتیان بدات و لێیان خۆش بێت .

**الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على أشرف الناس و المرسلين**

**https://t.me/bahasht_bo_namokan**

# پێڕست

چەند تێبینیەك بەر لە چوونە سەر كتێبەكە.......... 1

باب : (١).......... 3

ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەوشتی ناشرین و كەڕاهەتێتی ڕەوشتی ناشرین.......... 3

باب : (٢).......... 6

كەڕاهەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی لەعنەت كردن لە ئیماندار و تەكفیر كردنی.......... 6

باب : (٣).......... 9

كەڕاهەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی جنێودان بە خەڵكی و دەم خستنە ناموسیان.......... 9

باب : (٤).......... 20

كەڕاهەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی قسەی بەتاڵ و زمان پیسی.......... 20

باب : (٥).......... 25

كەڕاهەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی لەعنەت لە یەكتر كردن و لەعنەت كردن لە ئاژەڵان.......... 25

باب : (٦).......... 27

چی هاتووە دەربارەی یەكێك جنێو بدات بە باوكی و لەعنەتی لێ بكات و قێزەونیەكەی لە لای الله ﷻ.......... 27

باب : (٧).......... 30

ئەوەی هاتووە دەربارەی یەكێك خۆی بەری بكات لە باوكی، وە لە كوڕەكەی، وە لە ڕەچەڵەكی، خۆی بداتە پاڵ غەیری عەشیرەتی خۆی.......... 30

باب : (٨).......... 34

كەڕاهەتی ئەوەی هاتووە لەسەر جنێودان بە مردووان.......... 34

باب : (٩).......... 37

چی هاتووە دەربارەی درۆ، وە بێزراوی ئەوەی دەبێتە ئەهلی درۆ.......... 37

باب : (١٠).......... 56

بابی خۆپەنادانی پیاو لە درۆكردن بە المعاریض.......... 56

باب : (١١).......... 63

ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕووخسەت بۆ درۆ.......... 63

باب : (١٢)........ 68
چی هاتووە دەربارەی کەڕاهەتی غەیبەت........ 68
باب : (١٣)........ 78
ئەوەی هاتووە دەربارەی کەفارەتی غەیبەت........ 78
باب : (١٤)........ 80
ئەوەی هاتووە دەربارەی نەمیمە کردن و کەڕاهیەتەکەی........ 80
باب : (١٥)........ 88
ئەوەی هاتووە دەربارەی نەدانی مافی دایک و باوك و بەگوێ نەکردنیان و قێزەونی ئەم ڕەوشتە........ 88
باب : (١٦)........ 97
ئەوەی هاتووە دەربارەی پچڕاندنی سیلەی ڕەحم کەڕاهەتی و قێزەونیەکەی........ 97
باب : (١٧)........ 106
ذەمی دوو ڕوویی و قێزەونیەکەی، وە پەنا گرتن بە الله لێی........ 106
باب : (١٨)........ 112
چی هاتووە دەرکەوتنی نیفاق و بڵاوبونەوەی........ 112
باب : (١٩)........ 118
ناشرینی توڕەبوون و خۆڕزگار کردن لێی........ 118
باب : (٢٠)........ 128
ئەوەی هاتووە لە ناشرینی بەخیلی، وە کەڕاهەتیەکەیشی........ 128
باب : (٢١)........ 141
ئەوەی هاتووە دەربارەی دراوسێی خراپ و کەڕاهەتیەکەی و زەم کردنی........ 141
باب : (٢٢)........ 148
چی هاتووە دەربارەی حەڕامێتی لە هەڵوەشاندنەوەی پەیمان و چوون بەرەو غەدر کردن........ 148
باب : (٢٣)........ 152
ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی شەرمی لێداماڵدراوە و لە حەڕامێتی و سەرزەنشت کراویەکەی........ 152
باب : (٢٤)........ 156
ئەوەی هاتووە دەربارەی حەڕامێتی بڵاوکردنەوەی تاوان لەناو خەڵکیدا........ 156

باب : (٢٥)........ 160

چی هاتووە دەربارەی پیاوێك كە پیاوان دەچنە لای خێزانی لە تاوان و حەرامێتیەكەی........ 160

باب : (٢٦)........ 162

ئەوەی هاتووە لەسەر حەرامێتی شانازی كردن بە جووت بوون و بڵاو كردنەوەی ئەوەی كە دەچێتە لای خێزانی خۆی........ 162

باب : (٢٧)........ 164

ئەوەی هاتووە دەربارەی نێربازی لە بێزراویەكەی و توندی سزاكەی........ 164

باب : (٢٨)........ 171

نەهی كردن لە چوونە لای ئافرەتان لە دواوە - كۆم - وە حەرامێتی ئەو كردارە........ 171

باب : (٢٩)........ 176

ئەوەی هاتووە دەربارەی زینا لە بێزراویەكەی و توندی سزاكەی........ 176

باب : (٣٠)........ 189

كەراهەتی ئەوەی مرۆڤی باوەڕدار پەشیمان ببێتەوە لە دیاریەكەی........ 189

باب : (٣١)........ 192

كەراهەتی ئەوەی پیاوێک لەگەڵ یەكێک قسە بكات وە كەسی سێیەمیان لەگەڵ بێت، تاكو دەبن بە چوار كەس........ 192

باب : (٣٢)........ 194

كەراهەتی ئەوەی پیاو بچێتە نێوانی دوو كەس یان تەداخولی نێوانیان بكات تاوەكو مۆڵەت وەرنەگرێت........ 194

باب : (٣٣)........ 197

كەراهەتی ئەوەی هاتووە پیاوێک براكەی هەجر بكات لە سەرووی سێ ڕۆژ........ 197

باب : (٣٤)........ 204

ئەوەی هاتووە دەربارەی پیاوێك زەواج لەگەڵ باوەژنی خۆی بكات لە تاوان و سزاكەی........ 204

باب : (٣٥)........ 206

ئەوەی هاتووە لەسەر سنور بەزاندن - داوێن پیسی - لەگەڵ مەحرەمەكانی خۆت وە تاوانەكەی........ 206

باب : (٣٦)........ 208

ئەوەی هاتووە دەربارەی سەرسام بوون بە خۆت و خۆ بە گەورە زانین لە تاوان و گوناهەكەی........ 208

باب : (٣٧)........ 226

کەڕاهەتی زیان گەیاندن بە خەڵکی .................... 226

باب : (٣٨).................... 228

چی هاتووە دەربارەی ستەم کردن لە خەڵکی وە دەست درێژی کردنە سەریان وە لە زەم کراوی ئەم ڕەوشتە و سزایان لە تورەیی و تۆڵەی الله ـ دا.................... 228

باب : (٣٩).................... 242

چی هاتووە دەربارەی فەزڵی سەرخستنی ستەم لێکراو، وە چی هاتووە دەربارەی تاوانی دانیشتن و بێدەنگ بوون لە سەرخستنی.................... 242

باب : (٤٠).................... 246

ئەوەی هاتووە دەربارەی تاوانی دزینی زەوی بە ستەم.................... 246

باب : (٤١).................... 251

چی هاتووە دەربارەی ئەوەی یەکێک یارمەتی ستەم کارێک بدات لە نەدانی حەقێک بە برایەکی موسڵمانی خۆی.251

باب : (٤٢).................... 253

ئەوەی هاتووە لەسەر کەڕاهەتی ئەوەی مرۆڤ شتێک لە براکەی ببات وەک گاڵتە پێکردن.................... 253

باب : (٤٣).................... 255

کەڕاهەتی ئەوەی مرۆڤ زۆر بڵێت وا گومان دەبەم - واتا سیقە نەکەی هەر بڵێی پێدەچێت - .................... 255

باب : (٤٤).................... 256

ئەوەی هاتووە دەربارەی کەڕاهەتی ئەوەی مرۆڤ قسەیەک بکات دواتر بیانووی بۆ بهێنێتەوە.................... 256

باب : (٤٥).................... 258

ئەوەی هاتووە لەسەر کەڕاهەتی قەبوڵ نەکردنی عوزر و ڕەتکردنەوەی.................... 258

باب : (٤٦).................... 260

کەڕاهەتی ئەوەی پیاو هاوڕێیەتی کەسانی خراپ بکات .................... 260

باب : (٤٧).................... 265

کەڕاهەتی نازناوی ناشرین دانان بۆ یەکتر.................... 265

باب : (٤٨).................... 268

ئەوەی هاتووە لەسەر تاوان و کەڕاهەتی سزادانی کۆیلە، یان عەیبدار کردن و شێواندنی.................... 268

باب : (٤٩).................... 276

کەڕاهەت و تاوانی ئەوەی کۆیلەیەک سەرپێچی بکات یان ڕابکات.................... 276

........................................................................................................... 277

باب : (٥٠)............................................................................................................ 277

(کەڕاهەتی بوختان کردن بە ئافرەتانی داوێن پاک.............................................................. 277

باب : (٥١)............................................................................................................ 280

ئەوەی هاتوە لەسەر کەڕاهەتی یاری کردن بە زار و مار و طاوڵە و شەتڕەنج و جگە لەوانیش.................. 280

باب : (٥٢)............................................................................................................ 284

ئەوەی هاتووە دەربارەی کەڕاهەتی گوێگرتن لە قسەی دوو کەس یان کۆمەڵێک کە پێیان ناخۆشە.............. 284

باب : (٥٣)............................................................................................................ 286

ئەوەی هاتووە لەسەر حەسادەت و پەنا گرتن بە الله لێی............................................................ 286

باب : (٥٤)............................................................................................................ 295

ئەوەی هاتووە لەسەر ڕووخسەتی حەسوودی وە قسەی رسول الله ﷺ حەسوودی نیە جگە لە دووشت........ 295

باب : (٥٥)............................................................................................................ 296

ئەوەی هاتووە لەسەر کەڕاهەتی زانستی ئەستێرەناسی و پێشبینی کردن و قسە کردن لە غەیبدا و باڵندە فڕاندن
........................................................................................................... 296

باب : (٥٦)............................................................................................................ 304

ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەوەی چی مستحبە بگوترێ لە کاتێکدا شومێتی لە دڵدا دروست دەبێت.................. 304

باب : (٥٧)............................................................................................................ 306

ئەوەی هاتووە لەسەر کەڕاهەتی ئەزیەت دانان و شت فڕێدان لەسەر ڕێگەی خەڵکی.............................. 306

باب : (٥٨)............................................................................................................ 307

کەڕاهەتی ئەوەی هاتووە کە پیاو بڕوانێت لە ماڵی خەڵکی بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت لێیان......................... 307

باب : (٥٩)............................................................................................................ 311

کەڕاهەتی ئەوەی هاتووە کە پیاو مۆڵەت وەربگرێت دوای ئەوەی چۆتە ژوورەوە.................................. 311

باب : (٦٠)............................................................................................................ 313

(ئەوەی هاتووە لەسەر کەڕاهەتی چونە حەمام بەبێ لەبەرکردنی جلی بەشی خوارەوە - لە ناوک بەرەو ئەژنۆ -... 313

باب : (٦١)............................................................................................................ 318

ئەوەی هاتووە لەسەر ڕووخسەت پێدان لە چوون بۆ حەمام............................................................ 318

باب : (٦٢)........................................................................................................................................ 320

كەڕاهەتی چوونی ئافرەتان بۆ حەمام........................................................................................................ 320

باب : (٦٣)........................................................................................................................................324

كەڕاهەتی ئەوەی هاتووە بۆ پیاو كە پیاوانی تر بۆی لەسەر پێ بوەستن - لەبەری هەڵبستنەوە -...........................324

........................................................................................................................................328

باب : (٦٤)........................................................................................................................................328

ئەوەی هاتووە لەسەر كەڕاهەتی سەفەر كردن بە ڕۆژانی هەینی..............................................................................328

باب : (٦٥)........................................................................................................................................ 329

ئەوەی هاتووە لەسەر كەڕاهەتی زەنگۆڵە لە سەفەردا یان لە كاروانەكاندا.............................................................. 329

باب : (٦٦)........................................................................................................................................331

كەڕاهەتی ئەوەی كە گەشتیار ئەگەر هاتەوە لە گەشتەكەی بە شەوان بەبێ دەنگی بچێتەوە ماڵی خۆی............331

........................................................................................................................................334

باب : (٦٧)........................................................................................................................................334

كەڕاهەتی ئەوەی پیاو بە تەنیا گەشت بكات........................................................................................................334

باب : (٦٨)........................................................................................................................................ 335

كەڕاهەتی ئەوەی سەلام بكەیت لە یەكێك لە كاتێكدا كە میز دەكات........................................................................ 335

........................................................................................................................................ 337

باب : (٦٩)........................................................................................................................................ 337

كەڕاهەتی ئەوەی پیاو بە برای موسڵمانی بڵێت : ویل بۆ تۆ........................................................................ 337